زنجیرەی کتێبی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم
کتێبی گیرفانی ژمارە ( 31 )

سەرپەرشتیاری گشتیی زنجیرە
ئازاد بەرزنجی

## فەلسەفەی ناتوند و تیژی

نووسینی: دێڤید مەکرینۆڵدز

وەرگێڕانی: کامیل محەمەد قەرەداخی

بابەت: فەلسەفی

بەڕێوەبەری هونەری: شیروان تۆفیق

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: سەیران عەبدولڕەحمان

هەڵەچن: نیشتمان محەمەد فاضل

تیراژ: 500 دانە

ژمارەی سپاردن: 133 ی 2003



www.sardam.net

## لەبری پێشەکی:

ئەم کتێبە لەو کتێبانەیە کە دەکرێ هەرکەسێك بەبێ بوونی پێشەکییەك لە سەری دەست بداتە خوێندنەوەی، کە تۆش هەندێکت لێ خوێندەوە دەڵێیت نەخێر پێشەکی ناوێ. بەلاّم بە پێویستم زانی ئەم چەند دێرە بنووسم بۆئەوەی بە خوێنەری بەڕێز بڵێم کە هەر ئەو کاتەی بەشی یەکەمی نووسراوە ئەسڵییەکەم خوێندەوە ئاواتم بوو کە هەموو کورد زمانێك ئاشنایییەك بەو فەلسەفەیە پەیدا بکات، چونکە فەلسەفەی ناتوندوتیژی دەکاتە توانای پێکەوەژیان و هەڵکردنی ناکۆکەکان بە یەکەوە، دەکاتە ئەوەی ناکۆکەکەت خۆش بوێت بۆئەوەی بتوانیت

لەگەڵیدا ئاشت بیتەوە. بۆیە لێی نەوەستام هێندە نەبێ کە چاوەڕوانم کرد بەشی دووەمیم وەگیر بکەوێت و بیخوێنمەوە، کە کەوتە دەستم و خوێندمەوە بڕیارمدا بیکەم بە کوردی، ئەوە بوو دەستم دایە و لە ماوەیەکی کورتدا تەواوم کرد.

ئێستە وەك کتێب پێشکەشی هەمووانی دەکەم بەو ئومێدەی هەمووان بتوانین سوود لە ئەزموونەکانی فەلسەفەی ناتوندوتیژی وەربگرین.

کامیل محەمەد قەرەداخی

## فەلسەفەی ناتوندوتیژی

*ئـەم تێبینییانـە هـەوڵێکن بـۆ کورتکردنـەوەی بنـەماکان لـە فەلسـەفەی نـاتوندوتیژیدا. ئێمـە وا لەسـەر نـاتوندوتیژی دەنووسـین و واش باسـی دەکەین کە تەنها تەکنیکێکی ڕووت بێت. بەڵام مـن لای خۆمەوە لەو بڕوایـەدام کـە لـەوە زۆرتـرە، ئـەوە (فەلسەفەیەکی تاکڕەهەندە) و بە ئاسانی مل بەوە نادات کە بۆ بەرگریکردن لە ستەم، یان بۆ هاندانی ستەم بەکاری بهێنی. ئەگەر لە جیهانی واقعیشدا دەخرێتە سەر سەنگی مەحەك بەهایەکی نابێت.

کـاتێك کـە مـن لـە سـاڵی 1948دا چوومـە نـاو بزووتنـەوەی ئاشتیخوازییەوە، ئـەو کاتـە چـەمکی نـاتوندوتیژی وەك ڕێگایـەکی بـەکارهێنراو لـە گۆڕانکـاریدا ڕێبـازێکی نـوێ بـوو بـۆ وڵاتەیەکگرتووەکان، ئەوکاتە ئەو شتە بەرەنجامی ڕاستەوخۆی ئامۆژگاری و کارەکانی غاندی بوو لە هنـددا. جـاران لـە ڕووی مێـژووەوە وا سـەیری

ناتوندوتیژی دەکـرا کـە گـوزارە کردنێـك بێـت لـە مژدەهێنـــــەکان (ئینجیلـــــەکان) یـــــان چەشناوچەشـنکردنێکی فەلسـەفە ڕەواقییەکـەی (مـــارکۆس ئۆریلیـــۆس) بـــووە. بـــەڵام نـــە ئامۆژگارییەکانی ئاینی فەڵەیی، و نە ئامۆژگارییـە ڕەواقییـەکان لـە (بەرگـەگرتن) تێپـەڕیّ ڕێبـازێکی وایان پێنـەداوین مامەڵـەی ستەمی پێبکـەین. ئـەم شتە بۆ ئەوکاتە باش بوو کە (من) ئەو کەسە بم بە دەست ستەمەکەوە دەناڵێنم، بەڵام ڕێگایـەکی وای پیشان نـەدەدای کە ڕێگـەی ئـەوەت لێبگـریّ تـۆش ستەم لـە تیمـی سێیەم بکـەی. خـۆ جاران فەڵـەکان دەیانتوانی مەینەتییـەکانی ستەمێکی سـەخت بـۆ خۆیـان هـەڵبژێرن، بەڵام چی لـەو خەڵکە نافەڵەیـە دەکەی کە شتێکی وایـان نـەکردووە شایانی ئـەوە بن ئەشکەنجەی لەسـەر بخـۆن، ئـەوان چـۆن هـەوڵی ئەو دەربازبوونەیان لێدەدا؟

## گرفتی مامەڵەکردن لەگەڵ خرا پەدا

لـە پـاش جـەنگی جیـهانیی دووەمـەوە و بـە تایبـــەتیش لەگـــەڵ تاوانـــە ناهـــەموارەکانی قەڵاچۆکردنی کۆمەڵکوژیدا هەستێکی وا هەبوو کە تەنـها ئاشـتیخوازی -ڕەتکردنـەوەی کوشـتن- بـە پێی پێویست باش نەبوو. کۆمۆنیزم وەڵامێکی بۆ ئەمـە پێشـکەش کـرد، بـەڵام وەك ئـەوەی لینـین و ترۆتسکی باسیانکرد، ئەوە وەڵامێـك بـوو، تێیـدا (ئامانجەکە بەهانەی ئامرازەکەی دەقەبڵاند) لەگـەڵ هـاتنی سـاڵی (1945)یشـدا ئـەوە ڕوونبـووەوە کـە کۆمۆنـیزم لـە باشـترین بـاریدا (تۆزێـك کـەمتر لـە فاشیزم خراپ بوو).

ئا لەم چۆڵییەدا و لـەم (جێگـە مێژووییـەدا) کـە خۆمانمـــان تێـــدا دۆزییـــەوە، کەســـانێکی وەك (هێتلـەرو ستالین)یـش هـەبوون لـە بەرامبـەرماندا وەسـتابوون، ئـا لـەو کاتانـــەدا دەکـرا ناپـاڵمی ئـەتۆمیش ببێتـە دوایـین هـەنگاوی نـاو مێـژووی مرۆڤایـــەتی، ئـــا لـــەو کاتـــەدا بزووتنـــەوەی ئاشـــتیخوازی لـــە بەرامبـــەر وشـــە پێشـــووەکەی

(السـلمیه- ئاشـتییانه-بێوەیـی)دا ئـەو شـتەی هەڵبژارد کە ئەمڕۆ پێیدەڵێین (ناتوندوتیژی).

ئەوکاتـە ئیـتر منیـش چوومـە نـاو بزووتنـەوە ئاشتیخوازانەکەوە، هەرچەندە ئـەو حـزرە کـۆن، و حـزرە نوێیانـەش کـە دەدۆزرانـەوە دەخرانـە بـەر سەنگی تاقیکردنەوە. یەکێك لە شتە سەمەرەکانی مێـژوو لـەو کاتـە ئـەوە بـوو، کـاتێك کـە (نـاتوندوتیژی) گەڕایـەوە و هاتـەوە نـاو ژیـانی ئـەمریکاوە، ئەوکاتـە بریتـی بـوو لـە کاڵایـەکی خـراپ و درایـەوە بەسـەر خـاوەنیدا. کـاتی خـۆی تۆڵستۆی وتارێکی (هێنری دێڤید تـۆرۆ)ی لەسـەر (ڕق سـەختبوون و هەڵگەڕانـەوەی مـەدەنییان) خوێندبـووەوە، غـاندیش تۆڵسـتۆی خوێندبـۆوە، مارتن لۆسەرکینگی بچوکیش غاندی خوێندبۆوە، ئیـتر نـاتوندوتیژی ئایدیۆلۆژیایـەك بـوو دەوری جیـهان گـەڕابوو، هەرچییـەکی هـاتبووە ڕێ کاریگەرییـەکی لێوەرگرتبـوو، و کارێکیشـی تێکردبوو.

## هیچ ئایدۆلۆژیایەك بێ كەموكووڕی نییە

ئەوە شتێكی گرنگە لە هەوڵی تێگەیشتنی فەلسەفەی ناتوندوتیژیدا ئەوەمان لە یاد نەچێ كە هیچ فەلسەفەیەكی زیندوو نییە كەموكووڕیی تێدا نەبێ. بوارم بدەن دوو نموونە لەسەر ئەوە بهێنمەوە، ماركسیزم (هەرچەندە من زۆر قەرزارباری ماركسم) لەناو خۆیدا ناكۆكییەكی تێدایە لێی نابێتەوە، لەوەیدا كە بەهانە دەهێنێتەوە و دەڵێ (مێژوو بۆ ئێمەیە، لە ئەنجامی ئەو ناكۆكییانەوەی كە لە داهاتوودا دەگەن بە هەرەسی سەرمایەداری، سۆشیالیزم لێ لادانی نییە) باشە ئەگەر سۆشیالیزم لێ لادانی نەبێت، ئیتر بۆچی مرۆڤ پشووی خۆی نەدات و لە چاوەڕوانی كردنیدا دانەنیشێ؟ بۆچی سەركێشی بە ژیانی خۆیەوە بكات، وەك ئەوەی ئەو كۆمۆنیست و سۆشیالیستە ئازایانە لە ململانێیەكدا سەركێشییان بە ژیانی خۆیانەوە كرد كە پێشوەخت دەیانزانی ئاكامەكەی چییە؟

ئاینی بووزیش، کە من خۆم قەرزاری ئەویشم ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە بـووزا لـەژێر دارێکـدا دانیشت و بیری کردەوە، بەو بیرکردنەوەیەی ئەو ڕاستییەی دۆزییەوە کە (ئالوودە نەبوون) بەشێکی گەورەی بوو، ئەی کەواتە ئیتر بۆچی بووزا ئەرکی فێرکردنی خەڵکی کێشا؟ ئەگەر بووزا وەڵامەکەیی بەدەستهێنابوو، ئیتر بۆچی (هێشتا هەر بە ئالوودەیی جیهان مابۆوە؟) و خەڵکیشی فێردەکرد؟ من وەڵامی هەردوو پرسیارەکەم بیستو هیچیان قایلم ناکەن، چونکە ئەو فەلسەفانەی کە دەتوانن ڕێڕەوی ژیان بگۆڕن و مێژوو بگۆڕن، پڕن لە ناکۆکی، و تەنها ئایدیۆلۆژیا بچووکەکان وەڵامیان لە لایە. لە (ناتوندوتیژی)شدا وەڵامی هەموو پرسیارەکان دەست ناکەوێ، ئەویش هەر پڕە لە ناکۆکی، تێگەیشتنەکەی منیش لە ناتوندوتیژی هەر تێکەڵەیەکە لەو شتانەی کە لە (غاندی)دا خوێندوومەتەوە، لە (بایارد ڕەستین) و (ئـ. ج. مۆستە)م بیستوون، لە خوێندنەوەی فەلسەفەی ڕۆژهەڵاتی و ئینجیلەکانو کارڵ مارکس.. و هتدەوە دەستم

کەوتوون، لێرە بەدواوە هەوڵ دەدەم کورتەی ئەو شتانە بە دەستەوە بدەم کە فێریان بووم، ئەوەش دەزانم کە خۆم یەك بیرۆکەیەکی ڕەسەنم لەلا نییە.

## گریمانە بنچینەییەکەی ناتوندوتیژی

با بە گریمانێکی بنچینەیی ناتوندوتیژی دەست پێبکەین. (ڕەواییەکی ڕەها) هەیە و لە ئارادایە، بەڵام کەس لە ئێمە بە دڵنیایی تەواوەوە دڵنیا نییە لەوەی کە ماهیەتی ئەو ڕەوایەتییە چۆنە، هەریەکەمان بەشێکی لێ دەبینێ، کەسمان نییە بتوانێت تەواوی چمکەکانی بە یەکەوە بە تەواوی کۆبکاتەوە. با بیر لە (ڕەوایی) بکەینەوە. "جیهان" وەك ئەوەی کە ئەم زەوییەی ئێمەیە، "ڕەوایە" ئەگەر لە دەستەیەك خەڵکی پەرشوبڵاو بپرسین "ماهیەتی ڕەوایی ئەم زەوییە چۆنە؟" هەر یەکە و بە شێوەیەك وەڵامت دەداتەوە، کابرایەك کە لە دوورگەیەکی بچووکی ناو زەریای ئارامدا دانیشتووە پێت دەڵێ، زەوی لەوانەیە هەر هەمووی ئاو بێ، هەر تەنها ئەو شوێنەی وشکە کە ئەو خۆی و خێزانەکەی لەسەری دەژین. ژنێکی

خەڵکی (کەنساس)یش وەڵامت دەداتەوە کە زەوی وشـکارۆ و برنگێکـە هـەر ئەوکاتـە تـەڕ دەبـێ کـە ئاسمـان بـاران دەبارێنـێ، پێدەشـتێکە گـەنم داپۆشیوە، کۆچەرییەکی گەڕۆکی ناو بیابـانیش پێت دەڵێ زەوی وشکە، لمینـە، بـەردەوام لەگـەڵ بـادا دەجوڵێـت، بڕێکـی کمـی ڕووەکـی تێدایـە. ڕاوچییەکی ناو جەنگەڵێکی بارانـاویی بەرازیلیش سوورە لەسەر ئەوەی کە زەوی بە ئاو تـەڕە، بایش بە شێداری قورسە، ڕۆژەکان پڕن لە دەنگی مـەل و مـار و مـێروو، و گژوگیـا هێنـدە چـڕن، جووڵـەت ئەستەم دەکەن.

هەریەکە لەم قسانەی پێشوو، وەك بەشێك لـە ڕاستی ڕاستن، کەچی هیچ یەکێکیان نییە بەسەر ئـەوانی تریشـدا ڕاسـت بێـت. لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆرجـار دەچینـە ئـەو بڕوایـەی کـە ئـەو ڕاسـتییە لاوەکییـەی کە ئێمە هەستی پـێ دەکـەین ڕاسـتیی تـەواوە. بـە دەربڕینێکـی تـر –هـەر بوونـەوەرێکیمرۆیی بە ڕێگەیـەکی جیاواز هەست بە –ڕەوایی– دەکات. ئەو جیاوازییـەشمان لـە لای زۆربـەمان هێندە لـە وردیدایە کـە خۆمـان تێبینـی

نەکەین. بەڵام مەسەلەکە ئەوکاتە گرنگ دەبێ کە کەسەکە تووشی ڕەنگ کوێری هاتبێ و نەتوانێ سوور و سەوز لە یەکتر جیابکاتەوە- هەر ئەم هۆیەیە وایکردووە کە لە گڵۆپی ترافیك لایتیشدا تەنها ڕەنگی سوورەکە بۆ وەستان بەس نەبێ، بەڵکو بۆ ڕاوەستانی ڕەنگ کوێرەکان لە سەریشی دەنووسرێ "ڕاوەستە" هەر ئەمەش وا دەکات سوورەکەیان لە سەرەوە دابنرێ و سەوزەکەش لە خوارەوە، چونکە لەمەوە کەسی ڕەنگکوێر دەتوانێ بە جیاوازیی شوێنەکاندا جیاوازیی ڕەنگەکان بزانێ. کەڕ و کوێریش لە لەدایکبوونیانەوە لە جیهانێکدا دەژین کە (ڕەوایی)یەکەی لە ڕەوایی ئەو جیهانە کەمتر نییە کە تۆی تێدا دەژیت، بەڵام ڕەواییەکەی ئەوان جیاوازییەکی قووڵتری هەیە لەوەی تۆ.

ئێمە، یەکەیەکە، بوونەوەری ڕوو لە کۆتایی ئەم گەردوونەین، کە هێندەی ئێمە بتوانین هەستی پێبکەین گەردوونێکی ناکۆتایە. ئێمە لەوە دڵنیا نین کە گەردوون سەرەتا و کۆتایی هەبێ، بەڵام دڵنیاین لەوەی کە خۆمان سەرەتامان هەیە و

کۆتاییشمان دەبێ. سنورێکیش بۆ ئەو زەمەنە هەیە کە تێیدا دەتوانین هەندێك شت فێر ببین، ئەو شتانەش کە پێویستن فێریان ببین زۆر لەوە زۆرترن کە کەسێکمان ئەو مافەی هەبێ خۆی بە سەرچاوەی شتەکان دابنێت، مەگەر لە باشترین باردا کەسێك بە ڕێگەی بچوك و سنووردار ببێت بە سەرچاوە.

ڕەنگە لەوەدا دڵنیایەکی ڕەهابین -نمونەیی بین- کە لە پشتی وەهمەکانی جیهانێکی ڕەقەوە (ڕەوایی)یەك هەیە. (بۆیە دەڵێم وەهم چونکە جیهانی ڕەقێتی لە وردیلەی زۆر وردی نەشیاوی وزە دروست کراون و ئەو وزە وردانە وا بەیەکەوە بەستراون کە ئێمە بینیمان وا بزانین کورسین، مێزن، مرۆڤن.. هتد) بەلاّم من بۆیە (دڵنیایەکی ڕەهام، لەبەرئەوەی کە من لە کۆتاییهاتنم دوا ڕەوایی تەواو ڕەواش ئەوەیە کە من ناتوانم لە ڕەوایی تەواو ڕەوای هەر شتێك دڵنیایەکی ڕەهابم، بڕوام وایە کە ڕەوایی هەبێ، بەلاّم لەو بڕوایەدا نیم کە من هەمیشە لێی دڵنیابم، یەقین بم.

## ئەم بێهودەییە بەرەو کوێمان دەبات؟

هەموو ئەم شتانەمان وا دێنە پێشچاو زۆر بە پێچ و لۆچ بن، بەڵام بوار بدەن سەیرێکی غاندی بکەین کە وتویەتی (ڕەوایی خوایە، خوا ڕەوایە) ئەو ژیاننامەکەی خۆیی ناونابوو (ئەزموونەکانم لەگەڵ ڕەواییدا). غاندی شتەکانی هێندە بە ڕوونی وت کە دەکرێ ئاسان بە سەرماندا تێبپەڕێ کە مەبەستەکەی چی بووە. کاتێك کە پیاوێکی ڕۆژئاوایی لێی پرسیوە ئایا بڕوای بە خوا هەیە، غاندی دەستی لەسەر بەردێك داناوە، و وتوویەتی (خوا تەنانەت لەم بەردەشدا هەیە) ئەمە بەشێکە لە بیروباوەڕی هیندۆسی کە خوا لە ئێمە جیا نییە، هەر هەمان شت لە لای ڕۆژئاواش هەیە کە خوا لە ئێمە جیا نییە و لەگەڵ ئەوەشدا دوورە -خوا- ڕوونتر بڵێین شتێکی ناکەسێتییە و لە هەموو شتێکدا هەیە. بۆیە ئەوە ئەستەمە هێڵێکی جیاکەرەوە لە نێوان ئەم بڕوایە و، چەشنێکی بێبڕوایی ئاینیدا بکێشی. بە مانا هندۆسییەکان

(خوا هەموو شتەکانە) بەو مانایەی کە کاتێك غاندی دەڵێ (خوا ڕەواییە) ئەوە لێدوانێکی غاندییە کە لەوانەیە کەسێکی زانا خێراتر لە ئەوانیتری ئێمە لێی تێبگات. بە تێڕوانینی من هەمیشە پەیوەندییەك لە نێوان ئەم دیدگایە و هزری مارکسدا هەبووە. لەوێدا کە هەموو قەواڵەی مارکسیزم سەراپا بە لەبەرچاوگرتنی جیهانی ماتریالی بونیاد نراوە، و بە گەڕان بە دوای ڕەواییەکاندا بونیاد نراوە، بەو شێوەیەی کە هەر دەبێ تیۆرەکان واقعی ماتریالی لەبەرچاو بگرن. هەریەکە لە (کارڵ مارکس) و (موهەنداس غاندی) کاتێکی زۆریان لەوەدا خەرج کرد کە هەوڵیان دەدا ڕاستییە عەینییەکانی ڕەوشەکان بدۆزنەوە.

مارکس لەناو کۆمەڵ و گردە کتێبەکانی ناو مۆزەخانەی بەریتانیادا ئەو کارەی ئەنجامدا. بەڵام غاندی پێش ئەوەی بگات بەو ئەنجامە سەیری چەندان ڕاپۆرتی کرد، چەندان ئاماری خوێندەوە، گوێی لە جوتیارەکان گرت و پشکنینی بە دوای ڕەواییدا کرد. هیچ کام لەم دوو پیاوە بە تەنیا دانەنیشتوون بیربکەنەوە و چاوەڕوانی ئەوە بکەن

لەسەر باڵی لۆژیك پێیان بگات. نەخێر. تەنها دێدەوانی کردن ڕەوایی پێدیاری کراوە، لە غاندیشدا زانایيەکی فیزیایی هەبووە، ئەو زاناییە ئامادەیی ئەوەی هەبووە چیی هاتبێتە دەست تاقی بکاتەوە.

## گەڕان بە دوای ڕەواییەکدا لە نێوا نماندا هاوبەش بێ

ئەگەر گەڕانەکەی غاندی بە دوای ڕەواییدا ئەوە بێ کە "خوا وەك ڕەوایی- حەقیقەت" دەبینێ ئەوا پاش ئەو کەسێکی (بێ بڕوا)ش دەتوانێ لە گەڕانیدا بە دوای ڕەواییدا لە غاندی نزیك بێتەوە بەوەی کە زەمینەیەکی هاوبەش لە نێوانیاندا هەبێ. بەڵام لەبەرئەوەی کە غاندی هەمیشە هۆشی لە لای ئەوە بووە کە هەرگیز ناتوانێ لەوە دڵنیابێ کە خۆی لەسەر ڕاستە - ڕەنگە زۆر جاری تریش بێینەوە سەر ئەم باسە- ئامادەش نەبووە لە کاتی تاقیکردنەوەکانی ڕەواییدا ئەوانی تر تێکبشکێنێ. بەڵێ، ئەو وابوو، بەڵام خەڵکانی تر وا نەبوون، ئەو هەمیشە هۆشی بەوە هەبووە کە هەستکردنی بە ڕەوایی سروشتی

شــتەکان "لاوەکــی و ناتــەواو بــووە" (بــەڵام مارکسیسـتەکان مـەیلیان وابـووە ئـەو هۆشـەیان نەبێ). ئەو ئەوەی دەزانی کە نەیارەکەشی بەشێك لە واقعی ڕەوا دەبینێ. کەچی پەسەندکردنی ئەم شـتە و داننـان پێیـدا کارێکـە بـە لای ئێمـەوە زۆر ئەسـتەمە. ژەنـەراڵیش بەشـێك لـە واقـع دەبینـێ؟ بەڵێ نیکسۆن بەشێکی واقعی دەبینی.

بـوارم بـدەن ئـەم "بەشـی یەکـەم"ە بـە باسـی شتێك لەسەر (ئـ. ج. مۆسـتە)ی ڕەحمـەتی کۆتـایی پـێ بهێنم، کـە کاریگەرییـەکی زۆر قووڵـی لەسـەر دانام، ئـەوەش ئـەو توانایـەی (مۆسـتە) بـوو، کـە بەرێزەوە گوێـی بـۆ ئـەو کەسـانە شـل دەکـرد کـە نـاکۆکیی قووڵـی لەگـەڵیاندا هـەبوو، دیـارە ئـەو گوێگرتنـەی وەك تـەکتیکێك نـەبوو، بـەڵکو بـەو مەبەستە بوو کە ئومێدی هـەبوو لـەو گوێگرتنـەدا. ڕەواییــەك ببیســتێ کــە بەســەر خۆیــدا تێپــەڕی کردبـێ. لەوانەیـە زۆربـەمان لـە مشــتومڕکردندا نــەتوانین بەوپــەڕی ئارامگرتنــەوە ڕاوەســتین (نەیار)ەکەمان قسەکانی تەواو بکات و ئـەمجا بۆی ڕاست بکەینەوە.

نــه (ئــ. ج. مۆســـته) پەلــەی ڕاســـتکردنەوەی نەیارەکەی هەبوو، و نه غاندی. ناتوندوتیژی شتی زۆری تێدایه، بەڵام ئەگەر گەڕانێك نەبێ بە دوای ڕەواییدا -گـەڕانێك کـە هـەرگیز کۆتـایی نەیـەت- ئەوا نووچ دەدات.

## حه تمییه‌تی ناکۆکی

ناتوندوتیژی گریمانی ئەوە دادەنێ کە بوونی نـاکۆکی حەتمییـه، لەبەرئـەوەی ڕوودانــی گــۆڕان حەتمییه، لەگەڵ گۆڕاندا ناکۆکیش دێتـە ئـاراوە. ئەگـــەر دیدێکـــی وا لـــە ئـــارادا بـــێ کـــە "ئاشتیخوازەکان" وەك "کەسـانی بێـوەی" ببینـێ (بە چاوپۆشین لەوەی کە خۆمان لەبەرئـەوەی ڕام نـەکراوین دەبینـە هۆکـاری سـەرهەڵدانی گرفتـی زۆرو زەوەند) ئەوا فەلسەفەکەی غاندی وا دادەنێ ئەو "واقع"ەی ئێمە دەیبینین لەناو دەچێ و گۆڕان و ناکۆکیش ڕێسان ناوازە نین.

ئـەم تێڕوانینــە بـۆ جیـهان هــەر زۆر کۆنــە - هێراکلیتس (ئـەو فەیلەسـووفە یۆنانییـەی کـە لـە سـاڵانی دەوروبــەری 535-475ی پێــش زاییــندا

ژیاوە) وتوویەتی هیچ واقعێك هەمیشەیی نییە، واقعی گۆڕان نەبێ، قسە بەناو بانگەکەی ئەو (ناتوانیت دووجار بە یەك ڕووباردا بپەڕیتەوە) وا دەڵێ. ئەم شتەش لە پتر لە ڕوویەکەوە دەکاتەوە کرۆکی مارکسیزم (کرۆکی مارکسیزم دەڵێ هەر شتێك ئێمە لەبەرچاوی دەگرین لە باری گۆڕاندایە) ڕەنگە ئەوە بەکەڵکمان بێت کە وا بیر لە جیهانی (واقع) بکەینەوە کە ئاوێکە لە سووڕی خۆیدایە، یان هەڵمە، یان سەهۆڵ چونکە شتەکان وا دیاردەدەن کە تا لەپڕ گۆڕانێکی گەورە ڕوونەدات هەست بە ڕوودانی گۆڕان نەکرێ. (ئەوە بە یادی خۆتان بهێننەوە کە چۆن لە کانونی یەکەمی 1955وە و لە پڕدا دامەزراوەی "جیم کراو" لە مونتێگمێریی ئەڵەباما شەقی برد)

ئەم شتە بە دیدی (غاندی)ی هندۆسی گریمانێکی ئاسان بووە، لەبەرئەوەی کە بڕوای هندۆسی وایە هەموو ئەو واقعەی ئێمە دەیبینین وەهمێکە واقعێکی قووڵتر دادەپۆشێ، واقعێکی سەرمەدیی لە ناسین نەهاتوو، بۆیە کاتێك کە ئێمە بیر لە غاندی دەکەینەوە دەبێ لە ڕۆڵی کاریگەریی

(بەهەگەفەد گیتا) لەسەر ژیان و بیرکردنەوەی غاندی تێبگەین (بە هەگەفەد گیتا- واتە سرودی خواوەند). ئەم گیتایە زۆر کۆنە (پێم وایە دەگەڕێتەوە بۆ نێوانی سەدەکانی پێنج و سرودی خواوەند). ئەم گیتایە زۆر کۆنە (پێموایە دەگەڕێتەوە بۆ نێوان سەدەکانی پێنج و دووی پێش زایین) و سرودێکی تا ئاستێك کورتیشە- (ئەو نمونەیەی کە من هەمە لە 140 لاپەڕە تێناپەڕێت- ئەوەی من ساڵی 1945 لە کتێبخانەی ئەمریکیی نوێ چاپکراوە- بە بۆربوونی کاغەزەکانی و لەرزۆك بوونیدا لەوە دەچێ ئەو کتێبە ئارامی نەدرابێ).

ئەمجا لەبەرئەوەی ئەم کارە لەناو هەموو کتێبە پیرۆزە هندۆسییەکانی تردا زۆرترین جەماوەری هەبووە، دیارە فەڵەیەك چەند بە ئینجیلەکان ئاشنایە و پەیڕەوییان دەکات، غاندیش ئەوەندە بەو ئاشنا بووە.

لێرەدا حەزدەکەم بەشێکی ئەو سرودە وەربگرم کە باسی شەڕێکی گەورەیە، لەوا نەبووە (ئەرجونا)ی جەنگاوەر بەشداریی تێدا بکات،

ئەرجونا کە سەیری ئەو دیمەنە دەکات کە پاشتر دەبێتە گۆڕەپانی شەڕێکی خوێناوی پەنا دەباتە بەر خواوەنـدی کریشـنا کـە بەرجەسـتەبوونی خواییە و دەڵێ:

## چۆن بتوانم زیانیان لێ بدەم؟

کریشـنا، کریشـنا/ کـە مـن دەڕوانمـە/ ئـەو خزمانەم/ ڕیزیان بۆ شەڕ بەستووە/ قاچەکانم خاو دەبنەوە/ دەمم وشك دەبێ/ لەشم دەلـەرزێ/ قـژم ڕێك ڕادەوەستێ/ پێستم دەمسوتێنێ/ کەوانەکەی غاندێیڤا/ لـە دەسـتم بەردەبێتـەوە/ مێشـکم وەك خولگەیـەك/ دەسـوڕێتەوە و دەسـوڕێ/ توانـای بەرگەگرتنی زۆرترم نەماوە/ کریشنا، دەبینم/ ئەو شتەی ڕەملی شەڕ لێدەدا/ دەبێ ئومێدی چیمان هەبێ/ لە کوشتنی خزمان؟/ مـن چـی بکـەم لـە؟/ سەرکەوتن و موڵك/ و بەهرەمەندبوون لێیان؟/ ئەی کریشنا/ چۆن بتوانم گرنگی بدەم بە/ دەستەڵات و چێژەکان/ و تەنانەت بە ژیانی خۆشم؟/ کە هەموو ئـەوانیتر/ مامۆسـتاکان، و باوکـان/ باپـیر، و مامـەکان/ کـوڕ و براکـان/ زاواکـان/ وەچـە و

ئامۆزاکان/ ئەوانەی کە تەنها لە پێناوی ئەواندا/ چێژ لە تامەکان ببینم/ ئێستە لێرە ئامادەبوون/ و وەستاون/ بە خوێن و ماڵیان/ شەڕی ئێمە بکەن؟

ئەی ئاگاداری هەموو شتێك/ تەنانەت ئەگەر ئەوان بۆیان ڕێك کەوت سەرم ببڕن/ چۆن بتوانم زیانیان لێبدەم؟/ ناتوانم ئاواتی ئەوە بخوازم/ هەرگیز، هەرگیز/ ئەگەرچی ئەوە/ عەرشی هەرسێ جیهانەکەم بهێنێتە دەست/ ئیتر سەروەریی زەوی/ چەند ئاسانترە/ کریشنا ئەی بیسەری/ هەموو نوێژەکانی مرۆڤ/ پێم بڵێ چۆن دەکرێ/ ئومێدی ئاسوودەییمان هەبێ؟/ ئەگەر ئێمە خەریکین/ ڕۆڵەکانی دەهر تیا ڕاشترا سەربڕین؟/ ڕەنگە ئەوان خراپ بن/ خراپترین چەتون بن/ لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر کوشتمانن/ تاوانەکەی ئێمە گەورەتر دەبێ/ چۆن بتوانین ئەو خوێنە برژین/ کە پێکمانەوە دەبەستێ؟/ خۆشیی کوشتنی خزمان/ لە کوێدایە؟/ ئەمە چ تاوانێکە/ من پلانی بۆ دابنێم، کریشنا؟/ کوشتن زۆر قێزەونە/ کوشتنی برا/ ئایا من بە ڕاستی/ ئەوەندە چڵێسم بۆ گەورەیی؟/ با لەبری ئەوە/ کوڕە خراپەکانی/ دەهرتیا ڕاشترا/ بە

پڕ چەکییەکەیانەوە بێن/ لە شەڕدا لە دژی من بن
من شەڕناکەم/ لێیان نادەم/ با ئەوان بمکوژن/ ئەوە باشترە.

کریشناش وەڵامی دەداتەوە، بۆی ڕوون دەکاتەوە کە لەبەرئەوەی ئەرجۆنا جەنگاوەرە پێویستە لە سەری ئەو شەڕە بکات (ئەگەر مانت لە بەشداریی ئەم شەڕە پیرۆزە گرت، ئەوە دەست لە ئەرکەکانت هەڵدەگری. لەمەدا هەڵە دەبی و لە پایەکەت دەکەویتە خوارەوە.. سەرکردە جەنگاوەرەکانیش وا دەزانن لە ترساندا خۆت لە شەڕ دەشاریتەوە).

## غاندی و کارما یۆگا

کریشنا لە سەری دەڕوا و ڕێگای (کارمایۆگا- واتە یۆگای کار) ڕوون دەکاتەوە. (ئێمە خۆمان وا ڕاهاتووین یۆگا بە چەشنێکی وەرزش دەزانین- بەڵام لە ئاینی هیندۆسیدا چەند چەشنێکی جۆراوجۆری ڕێبازی یۆگا هەن- یەکیان کارمایۆگایە) کە هەوڵدانە بۆ یەکگرتن لەگەڵ

خواوەنددا لە ڕێگەی کاری چاکەوە، نەك تێڕامان.
لێرەوە پێویستە ئەوە لە غاندی ببینین کە ئەگەر بتوانین لێی تێبگەین، کەسێکی هیندۆسییە ڕێگەی کارمایۆگای گرتۆتە بەر).

دەقی گیتا بە دیدی خەڵکانی سوونەتدۆستی هندۆس لەوانەیە هیچ باسێکی (ناوهێنانێکی) ناتوندوتیژیی تێدا نەبێ، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە پشتگیریی ئەوەشی تێدا بێ کە دەبێ مرۆڤ بە ئەرکە سەربازییەکەی خۆی هەستێ، بەڵام غاندی کە لە زۆر ڕووەوە کەسێکی ناسوونەتی بووە، لێرەشدا هەر ناسوونەتی بووە، ئەو وەك ڕێگای خۆشەویستی بەرەنگاریکردن، وەك "هێزی حەق-ساتیا گراها" سەیری کردووە، وەك ڕێگایەك بۆ دەربازبوون لە گیرۆدەبوون بە شەڕی براکوژییەوە سەیری کردووە. بەڵێ ئەو ئەوەی پەسەندکردبوو کە بە ئەرکی خۆی هەستێ، وەك ئەوەی کە سەر بە هۆزی جەنگاوەران بێ، بەڵام سروشتی خودی شەڕەکەی گۆڕی.

سەبارەت بە چڕکردنەوەی ئەو شتانەی پێویستە بخوێنرێنەوە پێداگیریی زۆر کراوە-

ئەگـەر دەقەکـە بـە وەرگـێڕانی "بەربـە هفەنـەندا و کریستۆفەر ئایشروود" تا ئێستا لە دەستدا مابن، ئەوانە شایانی خوێندنەوەن– (تێبینـی: ئەو دەقە لە دەستدایە و دەکرێ بخوێنرێتەوە. ئەگەر مرۆڤ نەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوەیە ئەستەمە بەم دەقە ئاسانکراوەی غاندی لە فەلسـەفەی نـاتوندوتیژی تێبگـات) ئومێد، بە دیدی غاندی ئەوەیـە، ئەگـەر هەر کێشەیەك بە "ناتوندوتیژی" چارەسەر بکرێ، ئـەوا کێشـەیەکی تـر "لـە ئاسـتێکی بـالاتر"دا ڕوودەدات. ئـــەم شـــتەی کـــە هندۆســـییەك پێیگەشـتووە دەنگدانـەوەی بیرۆکەیـەکی مارکسـە کە دەڵـێ هـەر دەبـێ دیالـەکتیك بمانگەیـەنێت بـە گۆڕانێکی ئیجابی. با بە دەربڕینێکی پراکتیکیـتر بڵێـین جیاوازییـەکی گـەورە نییـە لـە نێـوان "دیالەکتیکی ماتریالیستییانە"ی مارکس و هزری غاندیدا، ئەگەرچی مـارکس لـە بـێزراندنی ئـایندا ڕۆچووبوو، و غاندیش بـە پێچەوانـەوە بـە ئـایندا ڕۆچووبـوو. هـەموو مێـژوو بـە دیـدی مـارکس سـەربردەی "دیالـەکتیکێکی ماتریالیسـتییانەی نێـوان مـرۆڤ بـووە لـە ململانـەی مـرۆڤ لەگـەڵ

(دەوروبــەر–بیئــە)دا، و ئایــا چ کـــەلتوورێك لـــەم ململانەیـــــــەوە ســـــــەرهەڵدەدات، لەمـــــــەوە "خواوەندەکان"، خێڵە کۆچەرییەکان جیاواز بووە لە (خواوەندەکانی) ژیانی ناو شارە یەکەمینەکان.

چەمکی خواوەند لەو چەمکەی ناو تەوراتەوە – کە خواوەندی جولەکەکان خوایەکی ناو کۆمەڵێکی زۆری تر خواوەند بووە– بەڵام پێویست بووە کە جولەکەکان بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو، و بیپەرستن– بۆ ئەو (ئەڵا)یە دەگۆڕێ کە یەسوع باسی کردووەو یـەك خـوا و خوایـەکی گشـتی بـووە. بێگومـان بەشێکی بنەماکانی هزری مارکسیش ئەوەیە کـە بونیادە کۆمەڵایەتییەکان ڕەنگدانەوەی دەستەڵاتی خاوەنەکانی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانن.

## تەنها کەوتنەوەی کەیان

لـە گیتـادا یـەك دێڕی سـەرنجڕاکێش هەیـە کـە ناوەڕۆکەکەی دەچێتەوە سەر ناتوندوتیژی، دەڵـێ (لـە هـەموو سەرسـووڕهێنەرەکانی جیـهاندا، ئـەی سەرسـووڕهێنەر، ئـەو شتەیسەرسـووڕهێنەرە کـە

مرۆڤێك نییە، مردنی خەڵكانی دیی بینی لە دەوروبەری، وابزانێ خۆیشی دەمرێ" مردن دەستهاتێكی ڕەسەنە. ژیانمان بە دیدی خۆمان زۆر گرنگە- ئەوە ئەنجامی ئەزموونی خۆمانە- لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەگەڵ كۆتاییە مسۆگەرەكەیدا بسازێین. بەلای كەمەوە بەلای ئەوانە مانەوە كە بێ بڕوان (ئەو دنیا- ئاخیرەت) لە ئارادا نییە. ئەو شتەی كەوا دەكات ناتوندوتیژی ئەم هێزەی هەبێ، بەلای كەمەوە ئەوەیەتی كە ڕێز لە سروشتی دانسقەی هەموو كەسێك دەگرێ. هیچ كەس لە ئێمە پێش سەردەمەكەی خۆی لە ئارادا نەبووە، و جارێكی تریش سەرلەنوێ دووبارە نابێتەوە. هەریەكەی ئێمە چەشنێك لە -گەردوونێكی تایبەتی- شارەزایی هەیە، بۆیە وا چاكە بژیین، وا چاكە ژیان تاقی بكەینەوە، وا چاكە چێژ لەم شارەزاییە وەربگرین، وا چاكە بە شتە سەرسووڕهێنەرەكانی ژیان دڵخۆش بین. چونكە لە ڕووی پەلەكردنەوە، ئێمە مادەم هەر تەنها یەك جاری تیژڕەو لێرەین،

کەواتـــە هەســـت دەکـــەین ئـــەو مافـــەمان هەیـــە خۆشییەکان تاقی بکەینەوە.

ئـەم تاککەوتنـەوە قەبـە و سـەیرەیە وا دەکـات کەسـی ئاشـتیخواز هـەرگیز توخنـی تێکشـکاندنی کەسێکی تر نەکەوێ، چونکە لەگەڵ هەر مردنێکدا گەردوونێك بە تەواوی کۆتایی دێت و ئیتر ئەوەش نییـــە قـــەرەبوو بکرێتـــەوە. ئـــای ئێمـــە چ دروستکراوێکی سەیر و سەرسووڕهێنەرین، و ئایا جیاوازییـەکانی نێوانیشـمان چ جیاوازیگـەلێکن؟ ڕەنگـە ڕێزگرتـن و تێگەیشـتن لـە تاکێتییـەکانی هەرکەسـێك بـواری ئـەوەشمان بـدات کـە هەسـت بکـەین هـەمووومان لـە چیـدا هاوبەشـین، ئەگـەرچی هیچ شتێکی هاوبەشیش لە نێوانماندا نەبێ، جگـە لەوەی کە لە کۆتاییەکەی خۆمان دڵنیاین، لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە لەگەڵ ئەو واقعەدا بسازێین کـە هەمووومان دەمرین. ئەوەی کە پێویستە خۆمانی لێ لابدەیـــن (کوشـــتن)ە، هـــەڵی بـــەردەممان ئـــەو خۆلادانەیـە. ئێمـە هـەموو لـە پێـوەر و ڕوخسـار و ڕەگەز و ڕەنگی جیاوازەوە دێین، هەریەکە لـە ئێمـە هەڵگری یادەوەریی کەلتووری و خێزانیی جیـاواز

لــە ئــەوی تـــرە. نـــاتوندوتیژی کۆمەڵگەیـــەك دەگرێتەوە کە هەموو کەسێك لە بریی ئەوەی وا لـە خەڵك بکـات ملکـەچی پێوەرێکـی دیـاریکراو بـن، بتوانێ لەو کۆمەڵگەیەدا گەورەترین پایە بۆ ژیـانی خۆی دروست بکات.

## مردن وەك ڕەهەندێك

لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دڵنیـاین کـە ژیانمـان لـە خـاڵێکدا کۆتـایی دێـت -چـەند سـەیرە- بـۆ چێژوەرگرتن لە ژیان پێویستە هەست بەو ڕەهەندە بکـەین کـە مـردن دەیخاتـە سـەری. چونکـە گـەر چارەنووسمـان ئـەوە بووایـە بـۆ هەتاهەتایـە بژیاینایـە ئەوا هـەموو ڕۆژەکانی ئێمـە بـەهاکانیان کەمتر دەبوو- چونکە لەمەیاندا ڕۆژەکانمان ناکۆتا دەبوون (ئەمە تەواو وەك ئەوەیە کە ئەگەر کەسێك یەك پارەی یەك وەرەقەیی دە دۆلاریی پێ بێت زۆر لەو کەسە پتر ڕێـزی پارەکـەی خـۆی دەگـرێ کـە پڕیـەك ژووری لـەو پارەیـە هـەبێ) ئـەوەی کـەوا دەکات ژیانی ئێمە بەو خۆشییە بێ ئەوەیە بەختی ئێمـە لـە ئـەزموونکردنی ژیانەکـەدا- سروشـتێکی

بـڕاوەی هەیــە– ئامــادەیی ئێمــە بــۆ (ئــالوودە نـەبوون)مـان بـە جیـهانی مـادی و بـۆ هەسـتکردن بــەوەی کــە مــردن هەرشــتێکمان هــەبێ لێمــان وەردەگرێتەوە، تامێك بە ژیانی ڕۆژانـەمان دەدات. ئـەو پـەندە میللییـە کورتـەی هەڵوێستێکی هەڵەیـە کـە دەڵـێ (ئـەو کەســە براوەیــە کـە کـاتێك مـرد زۆرترین یاریی هـەبێ) چونکـە کەسـی مـردوو چـی لـە یارییـەکانی بکـات؟ چـەند خـۆش دەبـوو ئـەو پەندە بیگوتبا، یان بمانگوتبا (ئەو کەسـە براوەیـە پێـش بڕانـەوەی سـنوورەکەی واز لـە یارییــەکانی بهێنێ) من لە بیرمە جارێك (با یـارد ڕەسـتین) وتـی ئـەو جلانـە هـی خـۆت نـین کـە لــە کانتۆرەکــەتدا هەڵواسراون و ساڵی ڕابوردوو لەبەرت نەکردوون – ئــەوە شــتێکی ڕوونــە کــە تــۆ پێویســتت پێیــان نەبووە، و دەبـێ بیـاندەیت بـە کەسـێك پێویسـتی پێبێت. لە ئینجیلەکانی فەڵـەییدا (متـی16:12–21) باسی پیاوێکی دەوڵەمەند هاتووە کە رزقێکی زۆر و زەوەنـدی کۆکردۆتــەوە کـە بەشــی چـەند سـاڵی بکات، کەچی خوایش پێیگوتووە (ئەی گەمژە! تۆ

ئەمشە و گیانت لێ دەسەندرێتەوە- ئیتر ئەوە بۆ کێ دەبێ ئامادەت کردووە؟

بەم شێوەیە ناتوندوتیژی فەلسەفەیەکە لەسەر گریمانی گۆڕان دادەمەزرێ، لەسەر هەستکردن بەوە دادەمەزرێ کە گۆڕانیش دواتر دەبێتە هۆی ئازار و ستەم (بیر لە جەمبلز و، و ۆلۆورس و یەکێتی شورەوی بکەرەوە!) بۆ جیدی تریش بیر لە شۆڕشی پیشەسازی و ستەم چەشتنە دڕندانەکەی بکەرەوە. (ئەگەر بەراوردی ئەو ماوە کەمەی مانەوەی ستالین لە دەستەڵاتدا و کەتنەکانی بکەیت لەگەڵ ئەو ملیۆنان کەسەی کە لە کاتی فەرمانڕەواییەکەی ئەودا مردن، هەر لەو کاتەدا ڕووسیا وای دەنواند کە سەدەکەی هێناوەتە لەرزین و گوایە شۆڕشی پیشەسازی هەیە، ئەوا ستەم چەشتنەکە تەنها لە چێوە زەمەنییەکەدا بەو جیاوازییە نابێ) لە خەباتی دژی ڕەگەزپەرستیدا خەڵکە باشەکان خۆیانی وا تێدا دەبیننەوە کە کەوتوونەتە داوی چەند چەمکێکی کۆنەوە. بیر لە خەباتەکانی بواری (کار) بکەرەوە کە چەندین جار ڕێکخستنی سەندیکاکان چەندان خێزانی درز

پێبردووە، هەر لە ڕێگەی ئەو گۆرانییە سەندیکاییە کۆنەوە کە دەڵێ (لایەنگری چ لایەکی؟).

ناتوندوتیژی مانای هەوڵێکە بۆ (خەباتکردن لە دژی ستەم) بەبێ سەرکێشی کردنی تێکشکاندنی نـــەیارەکانمان، چونکـــە نـــاکرێ ئێمـــە لـــەوەدا دڵنیایەکی ڕەهابین کە ئێمە لەسەر حەقین (پێشتر لە مەمان کۆڵییەوە) هەروەها لەبەرئەوەی تاکێتیی ئەوانەش کە ئێمە دژایەتییان دەکەین لە هی ئێمە کەمتر نییە.

لەســـەر بەشـــێکی فەلســـەفەی نـــاتوندوتیژی پێویســتە ڕووبــەڕووی گرفتــی (ئالودەنــەبوون) بــە ماتریالیســتی و تەنانــەت بــە ژیــانیش ببێتــەوە – ئەمەش هەر لە موفارەقە دەچێ، چونکە ئێمە ژیان بە نرخێکی زۆر گران دەقەبڵێنین. ئێستە دەمەوێ باس لەو موفارەقەیە بکەم کە دەڵێ: ئێمە بۆئەوەی دادپــەروەری بەرقــەرار بکــەین، پێویســتە بوونــی ستەم پەسەند بکەین.

## ستەمی خەبات لە پێناوی داد پەروەریدا

هەواڵی خراپی یەکەم ئەمەیە دروشمێك دەڵێ (ئاشتی بە بێ دادپەروەری نابێ) ئەمە دروشمێکی میللییە، بەڵام سەرکێش کاریشە. بۆیە دەکرێ هەڵبگەرێنرێتەوە و ئاوا بخوێنرێتەوە (دادپەروەری بەبێ ئاشتی نابێ) چونکە زۆری گفتوگۆکانی سەرگۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی لە لایەن کەسانێکەوە دەکرێ خۆیان سەرکوتکراو نین، بۆیە ئەوان لەمەوە وا دەزانن پێویستە ژیان دادپەروەرانە بێت. ژیان دادپەروەر نییە. کاروانی گۆڕانی کۆمەڵایەتیش کاروانێکی داخوراو، و پڕپڕ لە ستەمیشە. بەڵام هەواڵە باشەکەش ئەوەیە کە دەکرێ ئەو دادپەروەرییە بەدی بهێنرێ بەڵام بە باجدانێکی زۆر قورس. ئەمە سەرەتای حیکمەتی هەموو شۆڕشگێڕەکانە بە توندوتیژ و ناتوندوتیژیشەوە. چەمکی (گۆڕانی قووڵی کۆمەڵایەتی) کار بەو واقعە دەکات کە تەنها سەرکوتکراوەکان بۆ گۆڕینی کۆمەڵ شتێك بە

شـتێك دەكـەن –چونكـە تەنـها ئـەوان گرنگــی بــە شتەكە دەدەن. پیاوان گرنگی بە ئازادكردنی ژنان نـادەن، خەڵكـە ڕاسـت و دروسـتەكان گرنگــی بــە ڕاسـتكردنەوەی خەڵكـە لار و خراپــەكان نــادەن، ســـپییەكان ڕەشـــەكان ئـــازاد ناكـــەن، نـــە ســەرمایەدارەكان ســەندیكا ڕێــك دەخــەن و نــە سـەربازەكانیش ڕێبەرایـەتیی بزووتنــەوەی چــەك داماڵین دەكەن. ئەمەش مانـای ئەوە نییـە هـەندێ پیـاو، و هـەندێ سـپی و.. هتـد.. نـەبن بەشـداریی خەباتی ئازادبوونەكان بكەن، بەڵام بە شێوەیەكی گشتی، بەریتانییەكان هندیان ڕزگار نەكرد، بەڵكو هندییــەكان كردیـــان، ســـپییەكانی باشـــوور سنووریان بۆ (جیم كراو) دانەنا، بەڵكو ڕەشـەكان كردیـان. لەهـەر كوێ ستەم هـەبوو (خـوا) ناچێتـە ئـەوێ دەســت ڕابوەشـێنێ و دادپــەروەری بــەرپا بكات. ئێمە خۆمان ستەم دەكەین دەنا ناكرێ.

ئەم شتە لە هیچیدا دادپەروەرانە نییە، تـۆ وا دەڵێـــی، بـــاش، وا نییـــە. بۆچـــی دەبـــێ ڕەشپێستەكانی باشوور، ئەوانەی كە بەم قووڵییەو بــەم درێژییــە بــە دەســت ڕەگەزپەرســـتییەوە

نالاَندووییانە ئەوان بچنە بەر باری سەرەکیی قورسی گۆڕانکاریی کۆمەلاَیەتی؟ تاکە هۆکار ئەوەیە کە کەسی تر نییە جگە لەوان بە کردەوە مەسەلەکەی بەلاوە گرنگ بێ.

## دۆزینەوەی داد پەروەری

ئەگەر لە سەرەتاوە لەگەڵ ئەم ئاشکراکردنەی فەلسەفەی ناتوندوتیژیدا هاتبیت ئەوەت لە یادە کە وتمان کۆمەڵگە هەمیشە لەسەر ڕەوتی گۆڕانە، ئەو گۆڕانەش هەمیشە ستەم چەشتنی تێدایە. هاتنەکایەی سیستەمی سەرمایەداری -کە ئومێدەوارین ڕۆژێك لە ڕۆژان شتێکی تر جێگەکەی بگرێتەوە- لەگەڵ خۆیدا ستەمێکی زۆری بۆ سەر زۆربەی خەڵك هێناوە (ئەگەرچی حەقبێژی وامان لێدەخوازێ کە دان بەوەدا بنێین کە ژیانی پێش سەرمایەداری ژیانی ڕابواردن نەبووە، و کەم کەس هەن ئامادە بن ئەم ژیانەی ئەمڕۆ پێیگەیشتوون، بیگۆڕنەوە بەو ژیانەی پێش ئەو).

چەسپانی کۆیلایـەتی لـەم وڵاتـەدا چەردەیـەك ستەمکاریی سەرسـەختانەی بـەرپا کـردووە، و لـە هـــەندێ ڕوویـــەوە ئـــەو کۆیلەێتییـــە لـــە فۆرمـــە بەراییەکەیدایە. بۆیە ئەگـەر بمانـەوێ ئەم ڕەوشـی ســـــەربازی و ڕەگەزپەرســـــتی و پـــــاوانکردنی ئابوورییەی ئێستامان بگۆڕین، پێویستە بـەوەش قـایل بـین کـە دەبـێ گۆڕانـی لـەم شـێوەیە لەگـەڵ خۆیدا ئازاریش بهێنێت. ئـەمجا بـۆ کەمکردنـەوەی ئەو ئازارە ئەو خەڵکانـە لە داهـاتوودا دەسـتەڵاتی دەوڵـــەت و ئامرازەکـــانی ڕاگـــەیاندن و (هـــەندێ جاریش کڵێسـا) بـەکاردەهێنن بـۆ تـانوت کردنـی بزووتنەوەی سەندیکایی.

ئـەمجا لەبەرئـەوەی ئێمـە لـە کۆمەڵگەیـــەکدا پـــەروەردە بوویـــن کـــە پێیوایـــە ســـەندیکاکان شەرعییەتیان هەیە، ئەوە شتێکی ئاسانە کە ئەوە لە یادی خۆمان بەرینەوە، کە تا سـەردەمێکی زۆر نزیك لە خۆمانەوە شەڕی سەخت ڕوویانداوە، ئـەو شـەڕانە هـەر ئـەوەندە نـەبوون کـە لـە کانـەکانی خـــەڵووزدا ڕوویـــانداوە، بـــەڵکو لـــە کارگـــەکانی بـــاکوور، و لـــە نێـــوان کرێکارەکـــان و خـــاوەن

کارەکانیشدا ڕوویانداوە. نزیکترینی ئەو شەڕانە لە خۆمانەوە لە ڕووی کاتەوە، بەڵام دوورترینیان لێمانەوە بە بەراوردکردنی هاوسەنگ سەربردەی شەڕی بزووتنەوەی مافە مەدەنییەکان هەیە.

شەڕێکی تری نزیک لێمانەوە بزووتنەوەی ڤێتنامە. تۆمارەکەش لە هەریەکە لە بارەکاندا دیارە: ئەوەیە کە ئەو کەسانەی هەوڵی دادپەروەرییان داوە دەبوو باجی قورستر بدەن. دیارە ئەمەش بە هیچ شێوەیەك ڕەوایی تێدا نییە، بەڵام ئیتر ئەوە ژیانە.

(مارتن لۆسەر کینگی بچوکیش) مرد، ئەو یەکێك بوو لە ئەو زنجیرە دووردرێژەی بەرەنگاریکاران کە سەرکردەکانی کۆمەڵەی نەتەوەیی هەڵساندنەوەی ڕەنگاوڕەنگەکان و قوتابیان و ڕێبەرانی کلێساکانیان تێدابوو، و بە تەقەلێکردن کوژران، یان بە ناڕەوایی کران بە داردا، یەك لە شەودا شی و شیتاڵ کرانەوە. ژمارەیەکی کەمی دادپەروەرخوازانی باشووریش کوژران (لە یادم نییە چەند بوون). بەڵام ئەگەر

ژیـان ڕاسـت و دروسـت بایـە ئـەوا ئـەو مردووانـە زیندوو دەبوون و بکوژەکانیشیان مردوو.

بۆیە هەریەکە لە ئێمە، لەبەر هەر هۆیەك ڕێگەی گۆڕینـی کۆمەڵگـە بگرێتـە بـەر دەبـێ قـایل بێـت بەوەی کـە (أ) گۆڕانکـاری واتـە ئازارچەشـتن و (ب) ئێمـە مـافی ڕەوای خۆمـان چـەند بـێ پترمـان بـۆ دەبێـت، لەبەرئـەوەی ئێمـە سەرپشـکین لـە نێـوان (تۆڵەسـەندنەوە، و گۆڕانکـاریدا و نابـێ هـەردووکیان بەیەکـەوە کۆبکەینـەوە. ئـەم شـتە بـۆ ئەو هەردووبارە ڕاستە کە ئێمە ئاشتیخوازبین، یان لەو کەسانە بین کە بڕوامـان بـە توندوتیـژی هـەبێ. سەیری ڤێتنام بکەن، لـەوێ کێشـەی ڤێتنامییـەکان لـە نـاو تـەرازووی دادپەروەریدایـە، لـەوێ ئـەوەندە دادپەروەرانەیـە کـە بـە کێشـەی ئەمریکاییـەکان بـەراورد نـەکرێ. لەگـەڵ ئەوەشـدا ئێمـە نزیکـەی (55000) کوژراومـان هـەبوو، و لـە دەسـتمان دان، بەڵام ڤێتنامییەکان پتر لە یەك ملیـۆن کوژراویـان هـەبوو. دواییش ئەوانـەی کـە ئێمـەیان بـەرەو ئـەو شـەڕە کێش کـرد یـان بـە مردنێکـی خوایـی مـردن،

یـان وەك (ڕۆبــەرت مــەكنمارا) چــوون ســـەردانی ڤێتنامیان كرد.

خـــەڵكی شۆڕشـــگێڕ دەزانێـــت كـــە ئامـــانج گۆڕانكـاریكردنی قووڵـە، نــەك یەكلاییكردنــەوەی حسابی كۆن. لێرەوە ڤێتنامییەكان پێشوازیی ئەو ئەمریكاییانە دەكـەن كـە كوشـتاریان لێكردبـوون. ئامـانجی ئێمــەش، وەك ئامــانجی ڤێتنامییــەكان كۆمەڵگەیەكی نوێیە، دیارە ئەم شتە پێویستە ئەو كەسانەش بگرێتەوە كە تا دوێنێ دوژمنمان بوون. ئامــــانجی شۆڕشــــی ســــەركەوتوو لــــە پــــاش گۆڕانكـــــاریكردنی كۆمەڵایەتییـــــەوە دەبێتـــــە ئاشــتبوونەوە. (خـــەڵكانی ئـــەفریقیای باشـــوور وانەیـەكی زۆر سەرنجڕاكێشـمان لەمـەدا پێشـكەش دەكـەن، لـە چۆنیـەتی مامەڵـەكردنی ئـەو كەسـانەدا كـە لـە سـایەی ڕژێمـە كۆنەكـەدا تاوانیـا دەرهــەق بــەوان ئــەنجام دابــوو، ئەفریقییــەكانی باشــوور لــە هەموویان خۆشبوون و لێبوردنیان بۆ دەركردن).

به دیدی كەسی ئاشتیخواز هەموو ئەم شتانە شتی موجەڕەدكاری نـین، بـەڵكو مانـای وایـە كـە ئێمــە لەبەرئــەوەی كــە دەزانــین نەیارەكــەشمان

کەسێکی ناو کەسەکانی خێزانەکەی خۆمانە – زۆرجار لە کێشە و ململانەی مەدەنیدا هەڵدەکەوێ کە هەر بە ڕاستی کەسێکی خێزانەکەی خۆمان بێ– لەبەرئەوە ئێمە ئامادەین ئازارەکە لە خۆمان بدەین، پتر لەوەی لە ئەوانیتر. من لە هەوڵی ئەوەدا نیم ئازار بکەم بە بتێك، چونکە کەسێکی مازۆخی نیم. ژیان چاکە، و ئێمەش دەمانەوێت چەند بتوانین لە ئازاردان کەم بکەینەوە و لەو ژیانەدا چاکەیەکمان هەبێ. (خوایە ئێمە لە پێناوی ئەوەدا بە ڕاستی کار بۆ گۆڕانی کۆمەڵایەتی دەکەین) ئەوەی من باسی دەکەم هەوڵدانە بۆ خۆلادان لەو ئازارە –سووربوون لەسەر چەکهەڵگرتن، بەو شێوەیەی کە بڵێی (ئەگەر دۆ و دۆشاو تێکەڵ بوون باشتر وایە من ئەو بکوژم، نەك ئەو من بکوژێ) ئەمە وەڵام نییە، وەڵامێکی خراپە. چونە لە ڤێتنام لە کوێ چەك بەکارهێنرا، لەوێ گەندەڵی لە کۆمەڵگەدا بڵاوبۆوە. لە وڵاتی ئێمەش لەوێدا کە جیابوونەوە و بەشبوونی نێوانی ڕەشەکان و سپییەکان بەو قووڵییە بوو، کە (ناتوندوتیژی) هەڵبژێردرا گەندەڵی لە کۆمەڵدا بڵاونەبۆوە، ئێمە

رۆژگـاری کۆیلـەیی و ڕەگەزپەرسـتی ئـەوەندەیان برین تێکردین کە بەسمان بێت- ئیتر پێویستمان بـەوە نـەبوو ئەوانـە شـەڕێکی نـاوخۆیی تازەشـی تێکـەڵ بکـەین (شـەڕە ناوخۆییەکـەی ئێمـە نموونەیـەکی نایابـە لەسـەر کاریگەرییـە ترسناکەکانی ئـەوەی توندوتیـژی ببێتـە فاکتـەری گۆڕانکـاری -چونکـە ئـەو شـەڕە نەیهێشـت هـەتا ناوەڕاسـتەکانی سـەدەی بیسـت مامەڵـە لەگـەڵ واقعـی ڕەگەزپەرسـتیدا بکـرێ و ڕەگەزپەرسـتیش ئـازاری ناهـەمواریی زۆری بەسـەر سـپییەکانی باشوور و ڕەشەکانیشیدا هێنا، ناهەمواریی ئێش و ئازارێك کە لە کتێبەکانی مێژوودا نەنووسراون).

## فاکتەرەکانی ستەمکردن و زاڵبوون بە سەریاندا

یـەکێکی ئـەو مەسـەلانەی کـە بـەردەوام قـووت دەبێتەوە چۆنییەتی مامەڵەکردنە لەگەڵ دڕندەیـی پۆلیسدا. دەکرێ ئێمـەش لـێرەدا بکەوینـە هـەمان ئـەو هەڵەیـەوە کـە دەسـتەیەکی (چـەپڕەوەکان)ی چینـی نـاوەند لـە سـەرەتای شـەڕی ڤێتنـامدا تێیکـەوتن، لـەوێ ئـەوان وا هێزەکـانی خۆمانیـان

تیرئەنداز کرد کە ئەوان دوژمنیان بن، دەکرێ ئێمە لە مێــژووەوە فـێرببین. چونکـە ئەگـەر تـۆ بتـەوێ بگۆڕێیــت پێویســتە لەســـەرت شـــتەکان خۆیـــان چۆنـــن، ئـــاوا لەگـــەڵیاندا ڕابێیـــت. لینـــین، ئـــەو ســـەرکردە بەلشـــەفییەی شۆڕشـــی ڕووســـیا، کـــە هـەرگیز ئاشـــتیخواز نـەبووە، هـانی خەڵکەکـەیی نەداوە جوێـن بە هـێزە تزارییـەکان بڵێـن، نـەخێر، بـــەڵکو هـــانی ئـــەوەی داوە کـــە گفتوگۆیـــەکی سیاسیانەیان لەگەڵدا بکەن، چونکە دەیزانـی کـە هێزە چەکدارەکانی ڕژێمە کۆنەکەی ڕووسیا هـەر تەنـها (خـــەڵکانێکی کرێگرتـــە) بـــوون و چینـــی فەرمانڕەوا بەکاریدەهێنان.

چونکە ئەگەر تۆ بتویستبا لـەوە دڵنیـابی کـە تـزار دەسـتی بـــە دەســتەڵاتەوە گرتـــووە و دەبـــێ دەستی پێـوە بگـری، ئـەوا تـۆش بـەردت دەگرتـە هێزەکانی و واتلێدەکردن ڕقیان لێت بێتـەوە. بەڵام ئەگەر بتویستبا تزار بڕوخێنیت، ئەوا ئەوکاتە هەر ئەو شتەت دەکرد کە خەڵکەکەی لینین کردیان – هەر هەلێکت بهاتبایەتـە دەسـت دەتقۆسـتەوە بـۆ بەرپاکردنی گفتوگۆیەکی سیاسی لەگەڵ پۆلیس و

هێزەکـانـدا و بـەرەنجامیش لـە کـاتی قـەیران دروسـتبووندا پۆلیـس ئامـادە نـەدەبوو ملکـەچی فەرمانەکانی تزار بێت.

بـا ئێسـتە هـەندێ لـە ڕووی کاتـەوە بێینـە پێشەوە بەرەو خۆپیشاندانە گەورەکانی (واشنتەن دی سی) کە لە دژی شەڕێ ڤێتنام بەڕێوە چوون، بۆ ئەو ڕۆژەی کە جەنگاوەرە دێرینـەکانی ڤێتنـام هـاتن میدالیا شـەرەفەکانی خۆیـان لەسـەر شـورای سـپی کۆشـکی سـپییەوە فڕێدایـە خـوارەوە وەك دەربڕینـی بێزارییـان لـەو شـەڕە. بـەڵام بـە چـەند ڕۆژێك لە پێش ئەم کارەیان هـاتن (نامەیەك بۆ برا شین پۆشەکانمان) یـان بەسـەر بنکـەکانی پۆلیسـی واشـنتەن دی سـیدا، لـەو نامەیـەدا ئـەوەیان ڕوون کردبـۆوە کـە شـەڕ چییـە و بۆچـی پۆلیسـەکان سەرکێشی بە گرتنی ئەوانەوە دەکەن. ئـەم کـارە وایکـرد پۆلیسـەکان نـەتوانن بـە سـەختی مامەڵـە لەگەڵ خۆپیشاندەراندا بکەن.

من بە پێی شارەزایی خۆم دەزانم کە زۆربـەی ئەو کەسانەی پۆلیسەکانیان ناونا (بەرازەکان) لـەو دەماودەمـەی شـەڕی ڤێتنـامدا یـان خۆیـان لـەو

کرێگرتانــەی پۆلیــس بــوون کــە ڕاســپێردرابوون سوکایەتی بەڕووبەڕووبوونـەوەکان بکـەن، یـان لـە تازە تێهەڵچووەکانی ناو بزووتنەوەکە بوون.

دیارە من ئەم بەهانانە بۆ ئەوە پێشکەش ناکەم بلێم (نـاتوندوتیژی)ن، بـەڵکو لەبەرئـەوە دەیانکـەم کـە قـاڵ و کـامڵن، پراکتیکـین، بێگومـان دەبـێ (نـاتوندوتیژی)ش هـەروابێ، ڕێگایـەکی پراکتیکـی بێ، توانای پیادەکردنی هەبێ، لە پێنـاوی گۆڕانـی کۆمەڵگـەدا، نـەك چەردەیـەك تیـۆری ئەبسـتراکت. سـتەمی هـەموو بزوتنـەوەکانی گۆڕانکـاریی کۆمەلایـەتی لـەوەدا حەشـاردراوە کـەوا لـە ئێمـەی پەیڕەوکارانی گۆڕانکاری دەخوازێ کە ئازارەکانی گۆڕانکاری بچێژین لە بریی ئەوەی هەوڵ بدات ئەو ئازارە بەسەر سەرکوتکراوەکاندا بسەپێنێ. لەمەدا پـەندێکی دەروونیـی قـووڵ هەیـە. ئەگـەر سەرکوتکارانت کەسێکی وا لەتۆدا ببینـن کە بـەرد دەوەشـێنێ و دروشـم دەوەشـێنێ و وەك بابـەتی ئیرەیی بـردن مامەڵـەیان لەگـەڵدا دەکات، ئـەوا ئـەم بینینەیان بۆ تۆ ئەو بڕوایەیان لەلا پتەو دەکات کە تۆ شایانی تۆز بە تۆزی هەموو ئەو ئازارەیت پێت

بگەیەنن، شایانی هەموو لێدانێکیت، هەموو کاتەکانی زیندانیکردن و لە کاتی پێویستیشدا شایانی هەر گوللەیەکی پێتەوە بنێن. بەلاّم کە ئێمە لە شوێنی خۆمان نەجولاّین، و ئازارەکەشی بچێژین بەبێ ئەوەی وەلاّم بدەینەوە، لێدانەکانمان پێ قبولّ بێت و لە کەسیش نەدەینەوە، ئەو کاتە ئیتر ئەو ڕێگەیە بۆ نەیارەکەمان دەکرێتەوە کە ئێمە وەك مرۆڤ ببینێ و گومان لە ڕەوشتەکەی خۆی بکات.

## دۆستانت یەك بخە و دوژمنانت بلاّوبکەرەوە

(سەلیقەداری) لە ناتوندوتیژیدا لە دۆزینەوەی ڕێگایەکدایە بۆ جیاکردنەوە و بلاّوەپێکردنی نەیارانت و لایەنەکەی خۆشت بە یەکگرتوویی بهێڵیتەوە. خۆ ئەگەر (مارتن لۆسەر کینگ)ی بچووك توند و تیژیی بەکاربهێنایە ئەوا ئەو کارەی بە زۆر ڕێگە هۆزە ڕەشەکەی دەتاراند– دابەش دەبوون، هەندێکیان لە بەکارهێنانی توندوتیژییەکە دەترسان، و هەندێکیشیان لەوە لاوازتر دەبوون کە بەکاری بهێنن و ئەمجا هۆزە سپییەکەش لە دژی دەوەستان. بەلاّم ناتوندوتیژی

شـتێك بـووه كـه هــەر ڕەشپێسـتێكی باشـووری توانیویەتی پێی هەستێت، هەرچەند لاواز بووبێ، یــان بــه ســالاچوو، و نــەخۆش بووبــێ. ئــەو ناتوندوتیژییه زیرەكیی ویستووه، بـەلام مەشـقی ســەربازیی نەخواســتووه. ئــەوەبوو كــه هــۆزه سپییەكه و بگره هەموو گەلەكەشی بلاوه پێكرد.

خــۆ ئەگــەر ئــەو بزوتنــەوه ڕەشپێســتییەی باشـوور كـاری بـه توندوتیـژی بكردبـا (لـه ڕووی ئاكاریشـەوه ئـەو مافـەی هـەبووه كـاری پـێ بكـات) ئەوا ترسی هەموو گەلەكـەی بـه یـەكجار دەگرتـەوه بـەلام لەبەرئـەوەی كـه ئـەوان نـاتوندوتیژی بــوون فشـارێكی نەتـەوەیی كێشـداریان بۆ سـەر كۆشـكی سپی دروست كرد كـه ئـەویش بەشـداری بكـات. (سەلیقەداری)ش بێگومـان هـەرگیز (سـەلیقەداری) نییـه، چونكـه لـەوێدا كه نـەیارانت چـاوەڕێی ڕق و تووڕەبوونت لێدەكەن تۆ دێیت (خۆشەویستی)یان پێشـكەش دەكـەی (یـان نزیكـترین شـتێكیان بـۆ دەكـەیت كه لـه خۆشەویستییەوه نزیك بێت و تـۆ بتوانیـت بیكـەیت). لـەوێدا كه ئۆپۆزسیۆن سووره لەسەر ئەوەی كه تۆ وەك شتێك ببینێت تۆ سوور

دەبیـــت لەســـەرئەوەی وا مامەڵـــەی ئۆپۆزســـیۆن بکەیت کە کەسانێکی دانسقەن و شیاوی بـەزەیین. بـە کورتـی، ئێمـە دەتوانین مەرجـەکانی ململانەکـە بگۆڕین، دەتوانن وەری بچەرخێنن –لـەو میانەیـەدا کە ناچار دەبین بە دەست (ستەمەوە ئازار بچێژین) لـــەو ژانگرتنـــــەوە (هیـــــوای دادپـــــەروەری) لەدایك دەبێ.

هیـچ دادپەروەرییـەك لـە مێـژوودا نییــە، مەگــەر ئێمـــە خۆمـــان دۆزیبێتمانـــەوە. دۆزینـــەوەی دادپەروەریش ناچارمان دەکات بەشێکی گـەورەی ئازاری ململانـە و گۆڕانەکە بگرینـە خۆمان بۆچـی ئێمـە ئـەوە دەکــەین؟ لەبەرئـەوەی ئێمـە لـە خـێری خـواوە بوو، یـان بە ڕێکـەوت بـوو کـەوتین بەسـەر ڕاسـتییەکدا فـێری کردیـن کـە ئۆپۆزسـیۆنەکەمان برامانـە، خۆشـکمانە، ئێمـە بـاجێکی زۆر گـەورەی ئـەوە دەدەیـن، ئەگـەر مەسـەلەکە پێویسـت بکـات پێش خۆمان ئەو ئازارە لـە خـەڵکانی تر بدەیـن کە مێژوو لە ئێمەی داوە. ئامانجی ئێمە وەرچەرخان و سازانە، ئەمانە چییێتیی شۆڕشن.

## بەڵێ، ئەی بەڵام هێتلەر.. چۆن؟

لە خاڵێکدا ئەم پرسیارە تەقلیدییە (بەڵێ، ئەی بەڵام هێتلەر چۆن؟) ڕووبەڕووی ئاشتیخوازەکان دەبێتەوە، کە بە زۆر ڕێگای جیاواز جیاوازیش دادەڕێژرێ، وەك ئەوەی بپرسن بڵێن (بەڵی، ئەی بەڵام شارۆن.. بن لادن.. تاوانباران.. فاشستەکان.. ڕەگەزپەرستەکان.. سرب.. و کروات.. و ئیسلامییەکان چۆن؟".

لە یەکەم نیگاوە، هیچ شتێك لەو چەمکە نامۆتر نییە کە گەلێکی بێوەی (وەك هند) تەحەدای هێزێکی داگیرکەر یان بونیادێکی ڕەگەزپەرستی سەرکوتکاری ستەمکار (وەك وڵاتە یەکگرتووەکان) بکات. بەڵام هەندێ کەس هەن سەرکەوتنی لەو جۆرە (مەبەستی لە سەرکەوتنی پرۆژەی ناتوندوتیژییە -و-) بە دوور دەزانن، بە بەهانەی ئەوەی کە ئەم تەکتیکانە لە دژی هیتلەر کەڵك ناگرن. چونکە بە ڕاستی (ناتوندوتیژی بوونی نەیارێکی مرۆیی، فەڵەی، شەریفی،

دیموکراسی دەوێ.. وەك خەڵکە باشوورییە سپییەکان یان بەریتانییەکان.. دەنا شکست دێنێ).

بەشێکی گرفتەکە لێرەدا ئەفسانەیە. بەریتانییەکان شتێکی کەم نەبێ (ئێسك سووکی)یان نییە، پاش کەمێکی تر دەگەڕێمەوە سەر ئەمە. بەڵام یەکەم شت (ڕاستییەکی ترسناك) لە ئارادایە پێویستە هەر هەموومان چ ئاشتیخواز بین، یان نیازی توندوتیژترین تیرۆرستیمان هەبێ، پێویستە ڕووبەڕووی ببینەوە -سەرکەوتن لە هەموو شەڕەکاندا شیاو نییە، کۆمەڵە کاتێکی وا هەن هیچ شتێك تیایاندا کەڵك ناگرێ. (ئەمەش مانای وا نییە ئێمە پێویستە هەوڵ نەدەین- چونکە ئێمە نازانین کەی ڕەوتی مێژوو خەریك دەبێ بگات بە کرچ بوونەوە).

خراپییەکانی ڕەگەزپەرستییەکەی ساڵی (1955)ی مۆنتگۆمیری لەوەی ساڵی (1915)ی کەمتر نەبوو کە بزوتنەوەی پەیوەندیبڕینی پاسەکانی مۆنتگۆمیری دەستی پێکرد، هەروەها ئەوە یەکەم بەرەنگاریکردنیش نەبوو، چونکە

پێشتریش ڕەشپێستەکان سەرکێشییان بە ژیانی خۆیانەوە کردبوو، بگرە لە کاتی (ئەزموونە ئەمریکاییە)کەی خۆیاندا کیانیشیان لە دەست دابوو.

## هەندێجار هیچ شتێك سەرناگرێ

لە باشووری ئەفریقا لە چەند ساڵێکی رابوردووی پێش ئێستادا (دەیان ساڵ) هەڵمەتێکی ناتوندوتیژی بەرپابوو (موتیلال ی کوڕی غاندی) ڕێبەرایەتی دەکرد، بەڵام شکستی هێنا. با بەبێ خۆجوانکردن ڕاست و ڕەوان بین- تا ئێستا ئێمەش لەم وڵاتەدا و لە ئەرکی (هەڵگەڕاندنەوەی ئەمریکا)دا شکستمان هێناوە، چونکە کارەکەی ئێمە لە هەندێ ڕووەوە لە کارەکانی غاندی ئەستەم ترە- چونکە هیندییەکان خۆیان دەیانزانی کە لە ڕووی سەربازییەوە لە بەرامبەری بەریتانییەکاندا نین و لاوازترن، بۆیە ئامادەبوون بە دوای ئەڵتەرناتیڤی تردا بکەونە پشکنین، بەڵام ئەمریکییەکان لەبەر ئەو چەکانەی

کە هەیانە وا دەزانن بەهێزن و ئیتر لەوەدا پەکیان کەوتووە کە بە دوای ئەڵتەرناریڤی تردا بگەڕێن.

بەڵام با بگەڕێینەوە بۆ لای بەریتانییەکان، واتە بۆ لای (ئەو خەڵکە فەڵە باشوورییە ئێسکسووکانە) ئەو بەریتانیاییانە خەڵکانی فەرمانڕەوای ئیمپریالیستی سەرکوتکار و لە کاتی پێویستیشدا توندوتیژ بوون. ئەگەر لە فەرمانڕەواییکردنەکەی هندیشیاندا چەند موفارەقەیەك هەبووبن، ئەوا ئەو موارەقانە دەگەڕێنەوە بۆ لێهاتووییەکەی ئیمپریالیزمی بەریتانی پتر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ گرنگی بەخۆدان. جگە لەوەش کە کەشە خولگەییەکەی هند سەرنجی ژمارەیەکی زۆری ئینگلیزەکان ڕاناکێشێت. ئەمجا بۆئەوەی فەرمانڕەوایی ئەو هندە ڕووبەر بەرینە بکەن، ئیستیعمارییە بەریتانیاییەکان پشتیان بە (خەڵکانێکی ئەهلی) بەست کە لەسەر کارگێڕیکردنی دادگا و پۆلیس و گواستنەوە و ڕاژەگوزاریی پۆستە و.. هتد ڕاهێنرابوون و مەشقیان پێکرابوو. ئەم شتانەش بە گۆشەنیگای مارکسیزم کۆمەڵە ناکۆکی و

ناڕێکییـــەك بـــوون کەڵەکـــە دەبـــوون. چونکـــە بەریتانییـــەکان هندییـــەکانیان لەســـەر کارامـــەیی کـــارگێڕیکردنی هنـــد مەشـــق پێکردبـــوو، بـــەڵام ئـــەنجامی ئـــەو کـــارە ڕێـــك کردیـــە ئـــەوەی کـــە دروســـتکردنی ئـەو دەســـتەبژێرە فـێرکراوە بـووە هـــۆی ئـــەوەی بتوانـــن ڕێبەرایـــەتی بزوتنـــەوەی سەربەخۆخوازی بکەن.

غاندی (ماف)ی لە لەندەن خوێند و وەك یەکێك لـــەو مافنـــاس و فەرمانبـــەرە زۆر و زەوەنـــدە حکومیانـــەی کـــە بـــەریتانیا بـــۆ ئیدارەدانـــی ئیمپراتۆرییەکـــەی خۆیـــان مەشـــقی پێکردبـــوون چـووە (باشـــووری ئـــەفریقا). لـــە ڕووی (ئێســـك سووکی)یەوە هیچ شتێك نەبوو بەریتانیاییەکان لە ئەڵمانـەکان جیابکاتـەوە. لـە سـییەکاندا ئـەڵمانیا شارستانی ترین گـەلی ئەوروپا بوو. بـەڵێ هیتلـەر دڕندە بوو، بەڵام بێگانە نەبوو.

دووەم، لەبەرئەوەی هۆلۆکۆست دۆکیۆمێنتاری کـراوە، و لەبەرئـــەوەی لـــە جەرگـــەی ئـــەوروپادا ڕوویـــداوە و (لەبەرئـــەوەی "باڵەکـــەی خۆمـــان" ســـەرکەوت) ئێمـــە زۆر شـــت دەربـــارەی ئـــەو

هۆلۆکۆستە دەزانین، ڕەنگە وایش بزانین کە ئەوە شتێکی بێوێنەیە. بەڵام بە داخەوە زۆر بە داخەوە شتەکە وا نییە. تۆمارەکانی بازرگانیی کۆیلەکان بوارمان دەدەن بچینە ئەو بڕوایەی کە ژمارەیەکی زۆری خەڵکە ئەفریقاییەکان لە سەردەمی ئەو بازرگانییەدا مردن، سەربردەی ڕووداوەکانی فەرمانڕەوایی بەلژیکی لە کۆنگۆ شۆکمان لێدەدات چونکە لە ماوەیەکی کەمی پاش کۆنترۆڵکردنی ئەو وڵاتە لە لایەن بەلژیکەوە لە سەدەی نۆزدەدا هێندەیان لە ئەفریقییەکان کوشت کە زۆرتر بوو لەوەی ئەڵمانەکان لە جولەکەیان کوشت، خراپە لە کاروبارە مرۆییەکاندا ڕەوشێکی جیهانییە و هەر نازییەکان بۆ خۆیانیان قۆرخ نەکردووە.

## خراپە لە مەسەلە و کاروبارە مرۆییەکاندا

ئەمریکییەکان پێویستیان بەوە هەیە بە وردی بڕواننە مێژووەکەمان، من هەوڵ نادەم لە بەهای هۆلۆکۆست کەم بکەمەوە، بەڵام تکا لە ئەندامە خۆجێییەکانی (پەیوەستی بەرەنگاریی شەڕ)

دەکەم کە ڕۆژی (22ی نیسان– ڕۆژی هاشووا) بە یادی خۆیان بهێننەوە، و لە گروپەکەی خۆتاندا ڕێز گرتنێك بۆ یادەکەی ڕێك بخەن.

بەڵام هیچ ئاشتیخوازێکیش ئەو مافەی نییە تێبکەوێت و بەهانەیەکی لەو چەشنە بهێنێتەوە بڵێت (ئازارەکەی من لە ئازارەکەی تۆ گەورەترە) بەڵام ئێمە لەوەدا دەبێ هەر پەیڕەوی لە ڕاستگۆیی بکەین کە ئێمە خۆمان یان گەلەکەمان بەشداریمان لە چیدا هەبووە. ئازار چەشتنی چوار سەدەی کۆیلەیی لە ئاستی خودی هۆلۆکۆستیشدا دەوەستێ.

لە وتارێکی ڕۆژی (97/10/8)ی گۆڤاری (نیویۆرك تایمز)دا هاتبوو کە ژمارەی پەسەندکراوی مردووەکانی ڤێتنام (3.6) ملیۆن کەس بووە، تاکە تاوانی ئەم هەموو مردووە ئەوە بووە لە دژی داگیرکەرێکی دەرەکی و لە پێناوی گەلەکەیاندا بەرگرییان کردووە. (وەك تایمز نووسیوویەتی ئەگەر ژمارەی ئەو مردووانە بە پێی ڕێژەیی لەگەڵ دانیشتووانی ئەمریکادا بەراورد بکەیت دەکاتە 27 ملیۆن ئەمریکی). بۆیە کاتێك

کەسێك دەڵێت (ئاشتیخوازی باشە، بەڵام لەگەڵ هێتلەردا کەڵکی نەدەگرت) دەبێ ئەو کەسە ئەوە لەبەرچاو بگرێ کە (لیندۆن جۆنسۆن)یش بە دیدی ڤێتنامییەکان هێتلەرێك بووە، و (جیم کراو)یش بەلای ئەمریکای ڕەشەوە هیتلەر بووە. ئێمە هەرگیز ئەوە نازانین کە ئایا ناتوندوتیژی لە دژی هیتلەر کەڵکی دەخوارد، یان نا (یان ئەگەر ڤێتنامییەکان ئەو ڕیبازەیان هەڵبژاردبایە لە دژی ئەمریکاییەکان سوودی دەبوو، یان نا؟) مێژووی هۆلۆکۆست بەرەنگارییەکی کەمی لایەنی جولەکە بۆ هیتلەر پیشاندەدات، لەوانەیە نەشیان بووبێت، ئەمەش شتێکی سەیر نییە– چونکە ئەوان بڕوایان نەدەکرد کە شتێکی سامناك -وەك دوایین چارەسەر– پلانی بۆ دادەنرێ. (لە ڕووی مێژووەوە جولەکەکان بەوە لە دژایەتیکردنی "سامی"یەتی ڕزگار بوون کە هەر دەیانویست نەکەونە بەرچاو). هەندێکیشیان وتوویانە (خۆ جولەکە بێوەی و ئاشتیخواز بوون، سەیرکە چییان لێهات) بمبەخشن، ئەوان سلبی بوون– لەمەشدا

جیاوازییەکی فراوان هەیە. چونکە هیچ ڕێگەیەك نییە بواری ئەوەمان نادات بزانین ئایا ئاشتیخوازیی کاریگەر بەختی کامڵ بوونی دەبێ، یان نا؟ ئەوەی ئێمە بیزانین ئەوەیە کە تاقی نەکراوەتەوە. لێرەدا بەرەنجامێکم یاد دەکەوێتەوە کە (هەننە ئەرندت) لەو کتێبەیدا نووسیوویەتی کە لەسەر (ئایخمەن)ە، ئەم خاتوونە لەو بەرەنجامەیدا دەگاتە ئەوەی کە بڵێت هاریکاریی سلبییانەی جولەکەکانی ئەوروپا لەگەڵ نازییەکاندایە وایکردووە هۆلۆکۆست گونجاو بێ. ئەگەر کەمێك بیر لەمە بکەنەوە، زۆر بە داخەوە دەبینن ڕاستە. چونکە شوێنهەڵگرتن و زیندانیکردن و گواستنەوەی شەش ملیۆن کەس کە بەرەنگاری بکەن– تەنانەت ئەگەر فەرمانی بەرەنگاری کردنیشیان پێبدرێت و ئەوان وەڵامیش نەدەنەوە، پێویستە هیچ نەبێ ئاژاوەیەکی گشتیی گەورە بنێتەوە. (بێگومان هیچ لەوە ئاسانتر نییە بڵێی.. (من بام بەرەنگاریم دەکرد) ئەمە دەربڕینی سۆزێکی هەرزانبەهایە لە لایەن کەسانێکەوە کە لەوێ نەبوون. هەندێکی بەڵگەنامەکان بوونی

شتێك لە بەرەنگاری پیشان دەدەن، لە شێوەی ڕاپەڕینی (گیتۆ وارشۆ) ڕەگدۆستەکان توندوتیژ بن، یان ناتوندوتیژ بەرەنگاری پیرۆز دەکەن.

## هەندێك سەرکەوتنی جیاجیای دژی هیتلەر

بەلام لەناو ئەوروپای داگیرکراودا چەند سەرکەوتنێکی (ناتوندوتیژی) هەن و ڕوویانداوە. لە نەرویژ مامۆستایان مانگرتنێکی سەرکەوتوویان ئەنجام دا لە دژی ئەوەی ناچار کرابوون وانەی ئایدیۆلۆژیای نازیزم بلێنەوە. لە دانیمارکیش ئەو پادشایە ڕێبەرایەتی ئۆپۆزسیۆنەکانی دژی نازییەکانی کردبوو کە وتبووی ئەگەر جولەکەکان ناچار کران (ئەستێرە زەردەکەی داود) دابنێن، ئەو خۆی، پادشا، یەکەم کەس دەبێ دایبنێت. بۆیە کاتێك کە نازییەکان کەوتنە جموجوڵی دەستگیرکردنی جولەکە دانیمارکییەکان، چەند ئەندامێکی گەشتاپۆ ئەم هەواڵەیان گەیاندە دەستەلاتدارانی دانیمارك و ئەوانیش لە ماوەی چل و هەشت سەعاتدا بە بێوەی هەموو جولەکەکانی دانیمارکیان

گواستەوە بۆ سوید. لە بولگاریاش، کە مێژووەکەی دژایەتیکردنێکی سامییەکانی تێدا نییە، بەرەنگاریکردنی هەرەمەکییانەی خەڵکی مەدەنی (وەك ئەوەیکە کۆدەبوونەوە و لەسەر هێڵە ئاسنینەکان دادەنیشتن) وایکرد نازییەکان نەتوانن هیچ جولەکەیەك بنێرنە دەرەوەی وڵات.

## ئەو فەڵە باشوورییە ئێسك سووکانە

لەناو ئەو شوێنانەدا کە ئەمریکییەکان بیریان لێکردۆتەوە کە ڕەنگە لەوێوە بەرەنگاریی (جیم کراو) دەست پێبکات (مۆنتگۆمیری، ئالاباما) دواین شوێن بووە بیری لێبکەنەوە. گەشتێکم لە یادە ساڵی (1951) بە پاس بەناو باشووری قووڵدا کردم، لە یەکەم گەشتی خۆم دەگەڕامەوە کە بۆ ئەوروپا کردبووم (لە بەشداریکردنی کۆنگرەی لاوانی ئاشتیخواز لە دانیمارك)ەوە دەگەڕامەوە.

کە لە نیویۆرکەوە بەرەو لۆس ئەنجلس گەڕامەوە، سروشم لە (بایارد ڕەستین) و گەشتی ڕێکخستنەکە وەرگرت و ملی ڕێگای پاسی گرایهاوندی باشوورم گرت.

کێبەرکێکانم کە بەرامبەر جیم کراو کردبووم زیندووانە بوو، من خۆم بە تەنها بووم، ئەگەرچی تەنانەت لە قەرەباڵەغیشدا من زۆر بوێر نەبووم.

بەلآم ئەو هەلەم بۆ ڕەخسا لە سەرەتای پەنجاکاندا سروشتی گەشتکردن بەناو باشووری قووڵدا ببینم و هەستی پێ بکەم. ئێستە نزیکەی نیو سەدە بەسەر ئەو کاتەدا تێپەڕیوە، ئەمەش وا دەکات دووریی (ئەڵەباما) هێندەی دووریی ئەڵمانیای نازی لێمانەوە دوور بێ. بەلآم ناڕەزایی دەربڕینی جەماوەریی سەرسوڕهێنەر لە دژی ڕەگەزپەرستی لەوێوە دەستی پێکردووە، لەوێ لە قوولآیی باشوور، کەئەوێ ئەو شوێنە نەبوو تێیدا (کۆکلۆکسکلان)ی چالاککاری بواری مافە مەدەنییەکان کەوتۆتە بەر مەترسی، لەوێ ئاوەژۆکردنی یاسا نەبوو، هەروەها ڕەشپێستەکانیش مافی دەنگدانیان نەبوو، شەویش شەو و کاتی ترس بووە نەك پشوودان، ئەمجا لەوێ لە بەردەم بە تەمەنەکانی باشووردا مەڵێ چەند ئارامی لە ناتوندوتیژیدا هەیە، چونکە ناتوندوتیژی ناتوانێت لە هەموو ململانەیەکدا

سـەربکەوێ، چونکـە بـەزینیش هەیـە. بـەڵام ئـەم هۆیانـە بـەس نـین بـۆ وازهێنـان لـە نـاتوندوتیژی، وەك ئەوەی کە ئەو هۆیانـە بـەس نـەبن بۆئـەوەی ئەگـــەر ســـەربازێك شـــەڕێکی دۆڕانـــد واز لـــە تفەنگەکـەی بـهێنێ. (تێبینییـەکی فەلسـەفی: لـە هـەموو ململانەیـەکی سـەربازیدا سـەرکەوتوو، و بـەزیو هەیـە، کەواتـە توندوتیژیـش لـە نیوەیـەکی کاتـەکاندا شکسـت دێنـێ و لـە نیوەکـەی تریـاندا ســـەردەکەوێ، بـــەڵام ئامـــانج لـــە ململانـــەی ناتوندوتیژی دۆزینەوەی کەسی سەرکەوتوو نییە، بـەڵکو گۆڕینـی خـودی ڕەوشـەکەیە - ئەمـەش چەمکێکە لە ڕەگەوە جیاوازە).

## بۆچی ناتوندوتیژی سەردەکەوێ؟

بـەڵام کـاتێك کـە دانمـان بـەوەدا نـا کـە نـاکرێ ئاواتە ناتوندوتیژییەکەی ئێمە لە هەموو شـەڕێکدا سـەربکەوێ، دەبـێ بپرسـین: بۆچـی سـەربکەوێ؟ بۆچـی لـە نـەرویژ و دانیمـارك لـە بەرامبـەر نازییـەکاندا سـەرکەوت، یـان لـە دژی بونیـادی

دەسـتەڵات لـە باشـوری ئـەمریکا و لـە دژی بەریتانییەکانی هند سەرکەوت؟

بـا ئـەوە بسـەلمێنین کـە هـەموو ڕووداوە مرۆڤایەتیەکان (هۆکاری زۆر و زەوەند)یان هەیە. بـۆ بزوتنـەوە ئاشـتیخوازییەکەی ڤێتنـام ئـەوە ئەستەم نییە هەست بەوە بکات لە وڵاتی ئێمەدا کە چۆن ناتوندوتیژییەکەی ئێمە ناکامڵ بووە، ئاواش ئێمە ئازارمان هەبووە لە بەرامبەر ئەو تورەکانەدا کە بە تەرمەوە دەگەڕانەوە بۆ وڵاتەکەی ئێمە لە ئـەنجامی هێرشـی خـەباتی سـەربازییانەی ڤێتنامییەکانەوە کە دەکرانە سەر هێزەکانی ئێمە. بـوار بـدەن دان بـەوەدا بنێـین کـە لـەو کاتـەدا بەریتانییەکان لە هیندا هەڵسوکەوتیان سەخت نەبووە، بەریتانیایش کۆمەڵگەیەکی دیموکراسی بووە و بواری داوە سیاسەتی دژە ئیستعمارییانە سەرهەڵبدات. بواربـدەن دان بـەوەدا بنێـین کـە توندوتیژیی ڕەگەزپەرسـتە باشـوورییەکانیش سـنووردار بـووە لـە ترسـی دەسـتتێوەردانی فیدراڵییانـە لـە کایـەی کۆمـەکی زۆری باکوورییەکاندا بۆ (مارتن لۆسەر کینگ)ی کوڕ.

بە گەڕاندنەوەی مێژوو بۆ دواوە، بۆ پێش (کۆمەڵگای مەدەنی) نمونەی دوو بزوتنەوە دەبینین کە لەبەرامبەر توندوتیژی نواندنێکی سەختدا هاتنە کایەوە:

1-بووزایی بە گشتی فەلسەفەیەکی ناتوندوتیژییە، سەرباری ئەو سەختی و ناهەمواری و سەرکوتکارییەی لە ئارادا بوو، لە هەموو ئاسیادا بڵاوبووەوە، تەنانەت ئەو مەغۆلانەشی ملکەچ پێکرد کە کارەساتی ناهەموارانەیان لە ئەوروپا و چیندا ئەنجام دابوو.

2-فەڵەیی (مەسیحییەت) کە تا پاش سێ سەدەش بەسەر مردنی (یەسوع)دا هاوپەیمانیی لەگەڵ دەوڵەتدا نەبەست، ئەمیش بوو بە هێزە ئاینییە زاڵەکەی ڕۆژئاوا و بەسەر سوڵتان و دەستەڵاتی (بەتران)ەکانی هەموو ڕۆمادا سەرکەوت.

هیچ کام لە فەڵەیی و بووزی فەلسەفەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی نەبوون، بۆیە لە سەدەی بیستدا چاوەڕوانیی ئامۆژگارییەکانی غاندی دەکرا. بەڵام ڕەوایی (حەقیقەت) جێگیرە وەك جێگیریی

بــەردێکی ســـەخت: هەریەکـــە لـــە شارســـتانی ڕۆژئـــاوایی و ڕۆژهـــەڵاتی لەســـەر بنەمایـــەکی ئـایدیۆلۆژیی نـاتوندوتیژی ڕاسـاون، لـە کـاتێکی زووی خۆیـاندا ڕووبـەڕووی ســەرکوتی ســەخت بوونەتەوە. بەم شێوەیە کاتێك کە غاندی کەوتۆتـە (کاری ئەزموونگەری لەگەڵ ڕەوایی‌دا) لـە سـەدەی بیستەمدا و بە دوای ئەگەری شیاوی بەکارهێنانی ناتوندوتیژی بۆ تەحەداکردنی ستەمی کۆمەڵایەتی کاری کردووە، ئەوە لەسەر بنەمایەك کاری کردووە کە زۆر نویێ نەبووە، چونکە ناتودوتیژی لە چاخی فەڵەیی دێرینترە.

## بۆچی سەربکەوێ؟

تـــا ئێســـتە کـــە هـــەوڵم داوە شـــتێك لەســـەر پاشـــینەی نـــاتوندوتیژی پێشـــکەش بکـــەم– وا دادەنێـم کــە ئێــوە بەمســۆگەری چــوار بڕگەکــەی پێشـووتان خوێندۆتــەوە– بۆیــە دەپرســم: چــۆن دەکرێت کەسـانێکی بێچـەك ئومێـدی ئـازادکردنی خۆیانیان هەبێ؟یەکەم، هیچ دابینێك بۆ ئـەوە نییـە کە ناتوندوتیژی لە هەموو بارێکدا سەربکەوێ.

ئەم وتەیە بە وردی ناتوندوتیژی لە جێگەی خودی توندوتیژیدا دادەنێ -چونکە کەسێکیش نییە دەست بداتە چەکی ئازادکردنی وڵاتەکەی و - وەك ڤێتنامییەکان- و سەرکەوتنی بۆ دابین و مسۆگەر بێ. مێژوو تۆمارێکی ئاشکرای پڕ لە شەڕی بوێرانەی بێشومارە و هەموو لە پێناوی دادپەروەریدا کراوە و بە شکستیش کۆتایی هاتووە. لەو نمونانەی کە شیاوی ناوهێنان نمونەی ئەو خەباتەی باشووری ئەفریقایە کە (مەنیلال غاندی)ی کوڕی غاندی لە پەنجاکاندا پێی هەستاو تێکۆشا بۆ ئەوەی گۆڕان لە سیاسەتی ڕژێمەکەدا بەرپا بکات، بەڵام خەباتەکەی بە توندوتیژی و شکانەوە کۆتایی هات. لە وڵاتی ئێمەشدا هەزاران باری وا هەن کە تێیاندا خەڵکانی ژێردەستە هەوڵیان داوە ئاشتیانە مامەڵە لەگەڵ ستەمدا بکەن و بەزیون.

یەکەمین وەڵامیغەریزەیی هەر مرۆڤێکی ساغ و دروست ئەوەیە کە ڕێگەیەکی (مکسۆگەر) بۆ چارەسەری کێشەکان بدۆزرێتەوە. چونکە تۆ چەند نزیك بیت لە کێشەی ململانەیەکی

مەترســـیداری دەمارگـــیری، کرێکـــاری، یـــان پـەیوەندیدار بە مافـەکانی مرۆڤـەوە –ئـەوەندە بـە ئاگاتر دەبی لـەوەی کە بە ڕاستی خەڵکانی زیـان پێگەیشــتوو پێیــان باشـــە زیانیـــان پێنـــەگات. لەبەرئـــەوە لەوانەیـــە هەمیشـــە چارەســـەرێکی ئاشتیخوازانەی ناتوندوتیژییانە یەکەم ڕێگا بێـت کە هـەڵ ببژێردرێـت. خـەڵك پـەنا بـۆ توندوتیـژی نابـات تـا هەسـت نـەکات کـە کەسـی سـتەمکار کەسێکە (لە زمانی توندوتیژی بەولاوە زمانێکی تر تێناگـات). لـە کـاتێکدا کـە مـن ئـەم تێبینییانـە دەنووسـم ڕەوشـێکی تراژیـدی لـە (کۆسـۆڤا) لـە ئارادایـە و ئاڵۆزیش دەبێ، لـەوێ خـەباتی زۆرینـە ڕەگەزییـە ئەلبانییەکـە دەبـێ بـە توندوتیـژی (ئەلبانـــەکان 90٪ی دانیشـــتووانی کۆســـۆڤان، هەرێمەکـــەیان لـــەژێر دەســـتەڵاتی ســـربەکانی یۆگسـلافیای جارانـە) ئـەو خەباتـە لـە شـێوازی نـاتوندوتیژی دەرچووبـوو، چونکـە دەسـتەیەك لـە گەنجە ئەلبانییە توورە و ئازاکان دەستیان کرد بە کوشتنی پیاوانی پۆلیسی سرب، سربەکانیش لە لای خۆیانەوە ژمارەیەکیان لەوان کوشت، ئەمەش

لەوانەیــە ئومێــدی چارەســەری ناتوندوتیژییانــە بشــێوێنێ لەبەرئــەوەی هــەردوولای کێشــەکە وا هەڵوێست لە یەك وەردەگرن کە (ئەوانە لە زمانی توندوتیژی بەولاوە لە زمانێکی تر تێناگەن).

## لەبەر یەکهەڵوەشانی کۆمەڵایەتی

ئاشتیخوازەکان هەوڵدەدەن ئەو هەلومەرجانە بدۆزنەوە کە تێیاندا نەیارەکان (ئازاد دەبن لەوەی ڕەوشتێکی جیاواز تاقی بکەنەوە) لەسەر ئەمەش سێ نمونە هەن دەکرێ بیانهێنینەوە (ئەگەر تۆژەرێکی مێژوویی هەبێ لێ بکۆڵێتەوە لە فنلەندەوە تا دەگاتە کەمبۆدیا نمونەی زۆر زۆرتر هەن) یەکەمی ئەو نمونانە نمونەی "هند"ە، و دووەمیان مانگرتنی لە پاسەکانی مونتگۆمیرییە کە لەو وڵاتەدا شۆڕشی مافە مەدەنییەکانیان دروستکرد، نمونەی سێیەمیشیان نمونەی کرێکارانی کێڵگەکانە کە (خافێس) ڕێبەرایەتیی دەکردن.

## دۆزینەوەی ڕاستی نوێی ڕووداوەکان

غـاندی دوو کـاری کـرد کـە هـەردووکیان لـە بەدەسـتهێنانی سـەرکەوتندا یەکلاکـەرەوە بـوون: یەکـەمیان ئـەوە بـوو وای لـە هیندییـەکان کـرد شانازی بە خۆیانەوە بکەن، هەستێکی وای پێدان کە ئەوان لە بەریتانییەکان لاوازتر نین. (کاتێك کە مرۆڤ سەربەگروپێکی بەزیو دەبێت، ئەوە شتێکی بـاوە کـە ئـەو مرۆڤـە وا هەسـت بکـات هـۆی بەزینەکەی لەوانەیە ئەوە بێت کە خـۆی شـایانی بەزینە ئەمە نموونە کۆنەکەی ڕق لە خۆبوونەوە و دانانی ڕێزی کەمە بۆ خود کە لەناو بەزیوەکاندا هاوبەشە، چ ڕەشپێست بن، یـان ڕەگـەزی بـەزیو، یان ئافرەتان.. و هتد).

کـاتێك کـە غـاندی ڕێپێوانـە بەناوبانگەکـەی خوێـی (لـە دژی باجدانانی بەریتانییەکان لە سـەر خوێ) بەڕێوەبرد ئەو کارەی هێندە ساکار بوو کە ئەگـەر بەریتانییـەکان هـەوڵی ڕاگرتنیـان بدایـە، گـەمژە دەردەکـەوتن، هـەموو هنـد چاویـان بڕیبـووە

ئەم پیاوە کە لەگەڵ دەستەیەك لە (شوراتەکان-موعتەزیلە)ی هاوڕێیدا بەناو هندا ڕۆشتن و بەرەو دەریا ڕۆشتن. لەگەڵ هەموو هەنگاوێکیدا هەند هەستی بە شانازییەکی نوێ دەکرد. دواجار کە گەشتە سەر دەریا و پرۆسەی خوێ کۆکردنەوەی دەستپێکرد (لەکاتی کشانەوەی هەڵچوونی دەریادا ئاوە بە جێماوەکە دەبێتە هەڵم و لە جێگەکەیدا بڕێك خوێی خاو بەجێ دەمێنێ و دەکرێ کۆبکرێتەوە) لەوێدا دەستگیرکراو خرایە زیندانەوە، بەڵام پێش ئەوەی دەستگیری بکەن لایەنگرەکانی خوێکەیان بە هەموو لایەکی هندا ڕەوانە کردبوو، و لەو شوێنانەش بە زیادکردنی ئاشکرا دەفرۆشرا و قازانجەکەی بۆ حزبی کۆنگرە دەبوو.

لەگەڵ هەر مەزادکردنێکی خوێکەشدا دەستەیەکی تر دەستگیر دەکران تا زیندانەکان پڕبوون و هەزاران کەس کەوتنە زیندان. لەو کاتەدا هندییەکی سەر بە هۆزێکی خانەدان لە لایەن پەیامنێرێکی بێگانەوە پرسیاری ئەوەی لێکرا کە ئایا کەسێك لەو پلە کۆمەڵایەتییەی ئەودا

بێت شەرم لەوە ناکات بکەوێتە زیندانەوە! ئەویش لە وەڵامدا وتی (بێگومان نەخێر، چونکە باشترین خەڵك لە زینداندان) ئەوە هەنگاوی یەکەم بوو کە وەك تەحەدایەکی ئاشکراو جەماوەری سەلماندی کە غاندی و لایەنگرانی زیندانەکانی بەریتانیا نەیاندەترساندن.

هەنگاوی دووەمیش لەم هەڵمەتە و لە زۆری ئەو هەڵمەتانەی تێردا کە غاندی ڕێبەرایەتیی کردوون بەرپاکردنی ئاژاوەیەکی قەبارەدار بووە بۆئەوەی بەریتانییەکان ناچار بکات کە ڕێکەوتنیان لەگەڵدا بکەن. یەکێکی ئەو چالاکییانەی کە غاندی سوور بووە لەسەرئەوەی بیکەن ئەوە بووە کە خۆیان جلوبەرگی خۆیانیان چنیوە بەو شێوەیەی کە پشت بەو لۆکەیە نەبەستن کە لە بەریتانیاوە دەهێنرا. (بەریتانییەکان تا ئەوکاتە لۆکەی هندییان بە نرخی هەرزان دەکڕی و پاشان دەیانڕست ولە ئینگلتەرە جلیان پێ دروست دەکرد و بەنرخی زۆر گرانتر دەیانفرۆشتەوە بە هندییەکان).

## تەونی چنین و شۆڕش

غـــاندی ئـــەوەی بـــەلاوە گرنـــگ بـــووە کـــە (بەرنامەیـەکی بونیادنەرانـە) بدۆزێتـەوە کـە ئـەو بەرنامەیە هەموو هندییەکان بە یەکەوە ڕابکێشێتە ناو بزووتنەوەکەیەوە. بۆیە (تەونی چنین)ی وەك هێمایەك بۆ (پشت بەخۆ بەستن) بەکاردەهێنا. ئیتر پلـە بـە پلـە دەزگـا بەریتانییـەکانی ڕسـتن و چنـین لەگـەڵ دابـەزینی کـاڵا نێردراوەکانیـاندا بـۆ هنـد دەکەوتنە بەر هەڕەشەی مایە پووچبوون. هەروەها بە ڕوانین بۆ مانگرتنی پاسەکانی مۆنتگۆمێریش ئەوەمان بۆ دەردەکەوێـتەوە، غـاندی توانیویـەتی واقعێکـی نـوێ بێنێتـە ئـاراوە. توانیویـەتی(واقعـە سیاسییەکان وا بگۆڕێت) کەبەریتانییـەکان ناچـار بکـات کـە یـان بـە تونـدی جەماوەرەکـە سـەرکوت بکەن، یان ڕێکـەوتنیان لەگـەڵدا بکـەن. زۆر ڕێگـە هـەبوون کـە غـاندی دەیتوانـی بـە هۆیانـەوە ئـەو واقعانە بەرپا بکات: وەك مانگرتنی جەماوەری لـە بـــەردەمی شـــەمەندەفەرەکاندا، مـــانگرتنی

سـەراپاگیری و "بـەرەنگاریی نێگـەتیڤی" کەبەرەنگارییـەکی زۆر بـەناوبانگ بـوو، و لـە سییەکاندا ڕۆژئاوای بەوپەڕی سەرسامی سەرسام کرد.

ئەوە ئەو پیاوە جەستە لاوازە بـوو، کـە بـەبێ چـەك بـانگی حـەقی دەدا، و لەگـەڵ ئەوەشـدا دەیتوانی دەستەڵاتی ئیمبراتۆریەتی بەریتانی لـە هنـددا پـەك بخـات. دەیتوانـی بـە تەنـها پـەیامێك جموجوڵی هەموو شەمەندەفەرەکان قەدەغە بکات. (سـەربردەیەکی مێژوویـی زۆر خـۆش هەیـە، زۆر کـەس نـایزانن، ئـەو سـەربردەیە دەگەڕێتـەوە بـۆ سەرەتاکانی شۆڕشی بەلشەفی- واتە شۆڕشەکەی لینین- ئەو ڕۆژە شۆڕشەکە بەهێزی چەك دەربـاز نەدەبوو- چونکە لە ڕۆژە بەراییەکانی پاش (25ی ئوکتۆبـەردا) بەلشـەفییەکان هـێزی چـەکداریان نەبوو، بەڵام بە شەڕی شەمەندەفەرەکان- شـەڕیان دەکـرد، ڕووسـە سـپییەکان (خـەڵکی ڕووسـیای سپی) هەوڵیان دەدا هێزەکانیان بەرەو (پترۆگراد) بحوڵێنـن کـە جەرگـەی شۆڕشـەکە بـوو، بـەڵام کرێکارەکـانی هێڵـی ئاسـن خۆیـان لایـەنگری

بەلشــەفییەکان بــوون، و شــەمەندەفەرەکانیان دوا دەخســت، یــان بــە ڕێگــای هەڵــەدا دەیانــبردن و کەسیش نەیدەزانی هۆکاری ئەو دواکەوتن و هەڵە ڕۆشتنە چی بوو، لەبەرئەوەی ئەو شەمەندەفەرانە بــۆ گواســتنەوەی هێزەکــانی ڕووســیای ســـپی بەکاردەهێنران.

(هەننە ئەرندت)یش زۆرکـاری لـەم شـێوەیەی تۆمـار کـردووە کـە لـە کۆتـایی جـەنگی جیـهانی دووەمدا ئیتالییەکان پێی هەستاون، لەو کاتەدا کە هیتلـەر هـەوڵی داوە هـەموو جولەکـەکان لـە ئیتاليـا بگوێزێتەوە بۆئەوەی لە قەڵاچۆکردنیان دڵنیا بێت –چونکە ئەو متمانەیـەی بە ئیتالییـەکان نـەمابوو، ئەوان ئەو کارەی بۆ ئەنجام بدەن، بەو شێوەیەی کە پێویستە. لێرەشدا دیسان شەڕی شەمەندەفەر ڕوویـدا، و شـەمەندەفەرەکان هـەرگیز نەیانهێشــت جولەکــەکان بگەنــە ئــەو شــوێنەی کــە بڕیــاربوو نازییــەکان لــەوێ چاوەڕوانیــان بکــەن بــۆ گواستنەوەیان. (ئەگەر ڕەوشـەکان بـەم شـێوەیەی خۆیان ترسناك و تراژیدی نەبوونایە، ئەوا هەموو ئەم ڕووداوانە لە کۆمیدیایەکی خۆش دەچوون).

**مۆنتگۆمێریی** 1955

کاتێك کە پەیوەندیبڕین و مانگرتن لە پاسەکانی مۆنتگۆمێری لە کانونی یەکەمی (1955) دەستی پێکرد، وا دەرکەوت کە نائومێدانە بێت، بەڵام لەو کاتەدا کۆڵۆنییە ڕەشپێستەکانیش هەر ئەوەندەیان لە تواناداد هەبوو سەرکێشیی پێوە بکەن. لەو کاتەدا ئەوان حکومەتی فیدراڵی پشتی نەدەگرتن، بەڵام ڕووبەڕووی هێزی چەکداری پۆلیسی خۆجێیی، و (دەوڵەتی)یش بوونەوە.

تا ئەوکاتە کەسێك نەبوو لە تەحەداکردنی بونیادی دەستەڵاتی سپیپێستەکانی باشووردا سەرکەوتبێ، لەبەرئەوە بەرەنگاریکردنیان وەك هەوڵی خۆکوژی وابوو. بەڵام کۆڵۆنییە ڕەشپێستەکان هەستیان کرد کە زۆر ئەستەمە بۆ پۆلیس بتوانێت مامەڵە لەگەڵ شتێکی ساکاری وەك سەرنەکەوتنی خەڵك بۆ پاسەکان دا بکات. پۆلیس دەتوانێ چی بەرامبەر بە خەڵکێك بکات کە خۆیان بڕیار بدەن لە بریی سەرکەوتنی پاس، بە پێ بڕۆن؟ ئەو زستانە و ئەو بەهارە هەموو هۆزی

ڕەش بە پێ و لاو و ماندوو و نەخۆشەوە لە مۆنتگۆمێری بڕیاریان دا و ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی بە پێ هاتوچۆ بکەن، ئەگەر کەسێکیش خۆی توانای ڕۆشتنی نەبووایە، ئەوا چڤاتی ڕیفۆرمی مۆنتگۆمێری ئۆتۆمبێلی بۆ گواستنەوی دابین دەکرد.

سپییەکان لە سەرەتاوە پێکەنینیان دەهات: چونکە بە پێ ڕۆشتنی ڕەشەکان هەڕەشەیەکی بۆ ئەوان دروست نەدەکرد! بەڵام (کینگ و یارمەتیدەرەکانی) شتیتازەیان لەو مانگرتنەدا دادەهێنا، لە سەرەتای ئەو شتانەوە کە ڕەشەکان لەوەوە فێربوون، ئەوە بوو کە زانییان دەتوانن سەرباری ترسەکەشیان هەر کار بکەن، بۆیە هەر هەنگاوێکیان هەڵهێنایە وایاندەزانی ئەوە هەنگاوێکە و لە ئامانجێکی نوێ نزیکیان دەخاتەوە. لەو کاتەدا ژنێکی سپی پێست کارەکەرێکی ژنی ڕەشپێستی هەبوو، کە ڕێگەیەکی دوورودرێژی دەبڕی و هەر بە پێ دەچوو بۆ سەر کارەکەی. بۆیە لێی پرسی کە ئایا بەو ڕۆشتنە ماندوو نابێ؟ ئەویش وەڵامی دایەوە

(قاچەکانم ماندوون، بەڵام گیانم ئاسوودەیە) ئەم شتە وایکرد کە گۆڕانێك لەناو کۆڵۆنییە سپییەکەدا (جالیە سپییەکەدا) ڕووبدات و هەر لەو گۆڕانەش بچێت کە غاندی توانی لەناو کۆڵۆنییە بەریتانییەکەدا دروستی بکات، جاران خەڵکانێك هەبوون وەك نیمچە مرۆڤ سەیری هندییەکان، یان ڕەشپێستەکانیان دەکرد، بەڵام لەوەوە و لەپڕ لەو کارانەوە وایان لێهات وەك گەلێکی بە کەرامەت سەیریان بکەن. لەوەوە و لەگەڵ تێپەڕینی هەر ڕۆژێکدا بشێوی لە بیری سپییەکاندا پتر کەڵەکە دەبوو، دەستەکەی (کینگ) تەنها یەك فیشەکیشیان نەتەقاند، لەگەڵ ئەوەشدا کۆڵۆنییەکەی ناوجەرگەی پایتەختە کۆنفدراڵییەکە هەستی کرد کە شتێك بۆ هەتاهەتایە دەگۆڕێ. بەشێکی ئەو گۆڕانە ئەوە بوو کە کۆمپانیای پاسەکان دانی بەوەدا نا کە هێندەی پارە لەدەست داوە وەختە مایە پوچ بێت. ئەمەش مانای وایە کە هەر هەموو بە ڕەش و سپییەوە لە (گواستنەوەی گشتی) بێبەری دەبن، لەوێدا ئیتر سپییەکان کە ئەم ڕاستییە یەخەی پێگرتن، ناچار بوون لەسەر

چارەسەرێك ڕێكەوتن بكەن. ئەوە بوو ئیتر بە چەند هەفتەیەك پاش دەستپێكردنی ئەو هەڵمەتە ڕەش و سپی بەیەكەوە لە پاسدا نەدەبینران، بۆیە (گیلن سمایلی) وەك یەكەم پیاوی سپی سەركەوتە پاسێكەوە و قۆڵی لە قۆڵی (دكتۆر كینگ) دابوو، وەك هێمایەك بۆ ڕۆژی سەركەوتن بە یەكەوە لە پاسێكدا دانیشتن: (گیلن سمایلی هاوڕێ و ڕێبەرێكی دێرینە، كاتێك كە لە زانكۆی لۆس ئەنجلس خوێندكار بووە، كارگێڕی نوسینگەی سوڵحكردنی برایانە بوو لە لۆس ئەنجلس).

## كرێكارانی كێڵگەكان و خافێس

سیزار خافێس، كرێكارێكی كۆچەر بوو، لە ساڵی (1962)دا ڕێكخستنێكی فراوانی بۆ كرێكارانی كێڵگەكان لە كالیفۆرنیا دەستپێكرد. خافێسیش هەروەك غاندی و كینگ لە دژی هەستی ملكەچیی ناو ناخی كرێكارانی كێڵگەكان كەوتبووە خەباتكردن. ئەو كۆلۆنییە مەكسیكییەی‌كە كۆچیان كردبووە كالیفۆرنیا زۆربەیان ئینگلیزییان نەدەزانی و لە ئیسپانیشدا

نەخوێندەوار بوون، و هەندێکیشیان بە شێوەی ناشەرعی لەوێ نیشتەجێ بووبوون، لەبەرئەوە ڕێکخستنیان کاری نەکردەنیبوو، و تەنها دەستگەلێکی کرێکاریی هەرزانبەها و گوێڕایەڵ بوون. بەڵام خافێس کارێکی بۆ کردن کە نە (یەکێتی کاری ئەمریکا) و (نە کۆنگرە بەهێزەکەی ڕێکخراوە پیشەسازییەکان) نەیانتوانی بۆیان بکەن، خافێس وای لە کرێکارەکان کرد هەست بە کەرامەتی خۆیان بکەن، ئەوەی پیشاندان کە دەکرێ ئەوانیش خەبات بکەن و سەربکەون. بە هۆی قوربانیدانی زۆر و زەوەندەوە، و لە دژی لایەنداریی پۆلیس و جەماوەری ئەوێ، ئەو (هەرێمی ترێ)یەی کرد بە (هێمای ئازار و ستەم)و خاوەن باخچەکانی ناچار کرد بێن لەسەر مێزی سەرکێشیکردن لەگەڵیاندا دابنیشن، لە ڕووی لێدان و تەقەلێکردنی ئەواندا کرێکارەکان بە ڕۆژووگرتن و پەیوەندی بڕین و ڕێپێوانی ئاشتییانە وەڵامیان دایەوە.

## لێکهەڵوەشانی کۆمەڵایەتی، کلیلەکەیە

ڕەنگــە شــیکردنەوەی ئــەم بیرۆکەیــە وام لێ پێویست بکات کە زۆر (بڕگە)ی تری بۆ زیاد بکەم، بۆیە ئەم (بۆچیسەربکەوێ)یە بە پێداگرتن لەسەر ئەوە دادەخەم کە ناتوندوتیژی بە هۆی (مانگرتنو موقاتەعـەکردن.. و هتـد)ەوە کـرچ کردنەوەیـەکی ڕێکی بۆ بوونیادی کۆمەڵایـەتی بەرقەرار کردووە. ناکرێ سیستمە کۆنەکەش لە کارکردندا بەردەوام بێ، چونکە دەبێ لە نێوان سەرکوتی توندوتیژانەو ڕێکەوتندا یەکیان هەڵبژێرن.

نــاتوندوتیژی لەبەرئــەوە ســەرناکەوێت کــە گوتاری خۆی ئاراسـتەی (باشـترین شـتی دوژمـن دەکات) (ئەگەرچی هەمیشە ئەو گوتارەش ئاراستە دەکات) ئەو کە سەردەکەوێ لەبەر ئەوە نییە کـە تەنها مامەڵەی بـرا، یـان خوشـك لەگـەڵ دوژمنـدا دەکات، بەڵکو لەبەرئەوەشە کە تەکتیکەکانی ئێمە ژان و ئازارەکانمان هــەڵدەمژێ. ئێمـە ئاژاوەیـەکی کۆمەڵایـەتی هێنــدە بــە قەببــەیی دەنێینــەوە کــە پێویســت دەکـات شــتێك نــەرم ببێتــەوە. ئێمــە هەمیشە بە هەڵسوکەوتکردنی بـە کەرامەتمانـەوە

نەیارەکەمان وا لێدەکەین بە چەند ڕێگەیەکی نوێ سەیرمان بکات، بەکارهێنانی توندوتیژی لەلا ئەستەم دەکەین (لەگەڵ ئەوەشدا کە دەبێ توندوتیژی هەر بەکاربێت: گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیە ناتوندوتیژەکان مانای نەبوونی توندوتیژی ناگەیەنێت، بەڵکو مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە لەگەڵ ئەوەشدا کە دڵنیاین توندوتیژی لە دژمان بەکاردێت ئێمە بە کاری ناهێنین) ئەو سەردەکەوێ لەبەرئەوەی چۆنێتی بیرکردنەوەی سەرکوتکراوەکان لە خۆیان دەگۆڕێت، متمانە و بڕوابەخۆبوون و عیزەتیان دەداتێ. ناتوندوتیژی هەموو کۆڵۆنییەکان دەژێنێتەوە: هەر هەمووان دەتوانن بەکاری بهێنن، بە پیر و گەنج و لاواز و بەهێز، و مامۆستا و نەخوێندەوارەوە، ئەمەش پێچەوانەی خەباتی چەکدارانەیە کە تەنها لاوانی تەندروست دەتوانن ئیشی تێدا بکەن.

## ڕێسا بنچینەییەکانی ناتوندوتیژی

وابزانم بڕگەیەك ماوە و ئیتر لەم بەشە تەواو دەبین. لە بەشی پێنجەمدا چۆنیەتی سەرکەوتنی ناتوندوتیژیم پیشان دا، ناتوندوتیژی دۆزینەوەی لێکهەڵوەشاندنێکی کۆمەڵایەتی، کۆمەڵە (واقعێکی نوێ) دەدۆزێتەوە، ئەو واقعە نوێیانە بوار بۆ نەیارەکەت خۆش دەکات بگۆڕێ. ئەم چەشنە سیاسەتەش بۆ خۆی هونەرێکە، و هەر ئەوە بەس نییە بە نەیارەکەت بڵێیت (من بێوەیم، تەقەت لێ ناکەم، بەڵام -بەو خوایە- ئەی گەمژەی نائومێد هەلێك لەدەست نادەم بۆم بلوێ ژیانت وا ئەستەم دەکەم کە ناچار بیت هەڵسووکەوتی شیاوانە بکەیت، ئەگەرچی هەموو جیهان دەزانێت تۆ بڕێکی زۆر کەم نەبێت خەسڵەتی مرۆڤانەت تێدا نییە.

ئەوە لە سەربەرزیی ئێمە ناوەشێتەوە کە ئەگەری گۆڕانی دوژمنەکەمان زۆرتر لە پێویست ئەستەم بکەین، بەڵێ سیزار خافێس خاوەن کێڵگەکانی ناچار کرد کە سەرکێشی بکەن بەوەی کە مانیان لە مامەڵەکردنی بەروبوومەکانیان گرت و

بەم مانگرتنەش جزدانی پارەکانی گرفتارکردن، خۆ ئەگەر ئەمەیان نەکردبا گفتوگۆ و ڕێکەوتنی نێوانیان هەر دەستی پێ نەدەکرد. بەلاّم ئەوە نارەحەتە بتوانیت ڕێکەوتن لەگەڵ پیاوێکدا بکەیت کە ڕقت لێ بێت و متمانەی پێ نەکەیت، ئەوەیان زۆر ئاسانترە کە ڕێکەوتن لەگەڵ نەیارێکدا بکەیت کە ڕێزی لێ بگریت و هەست بکەیت کە (ئەو بەلاّیەکی باشە)، ئەوانیش ڕێزی خافێسیان دەگرت.

لە سالاّنێکی ڕابردوودا لە (گرینیدج فیلاج) لەو ڕۆژگارە ڕابوردودا کە هەندێ جار ڕادیکاڵییەکان بەسەر سندوقی سابوونەوە گوتاریان دەدا، لە درەنگوەختی ڕۆژێکدا منیش لە گۆڕەپانی (شریدان) ویستم گوتارێك پێشکەش بکەم، کەچی پۆلیسێك هاتە پێشەوە و فەرمانی پێدام کە بوەستم. دیارە من پێم نەوت (نەکەی، هەی سەگە سەرسەختە بەرەلاّکەی دەوڵەتی ئیمپراتۆری، من دەستوور شارەزام، و مافی قسەکردنم هەیە، تەحەداتەکەم بتوانیت بمگریت). لە بریی ئەوە پێم وت (وا دەزانم مافی قسەکردنم هەیە. بەلاّم وا لە

سەکۆکە دێمە خوارەوە تا تۆ دڵنیایی لە سەرۆکەکەت وەردەگری، پاش پانزە خولەکی تر کە تۆ دڵنیابوویت، ئەمجا من دەچمە سەر سەکۆکەو قسە دەکەم. بەڵام ئەگەر سەرۆکەکەت سەلماندی گرتنم ڕەوایە، ئەوا منیش بەرەنگاریت ناکەم). پۆلیسە کە ڕۆشت پانزە خولەکەکە تێپەڕی و من وەستابووم، ئەمجا کەوتمە قسە و پۆلیسەکەش هەر نەگەڕایەوە.

## خاڵە بنەماییەکان

*ئەو کەسەی ناتوندوتیژی بەکاردەهێنێ هەوڵ دەدات ڕاست و ڕەوانی و پاکی و ڕاستگۆییەکی ڕەهای هەبێ.

*ئەو کەسەی ناتوندوتیژی بەکاردەهێنێ هەوڵ دەدات بەسەر ترسدا زاڵ بێت بۆئەوەی لە پایەی بەهێزییەوە قسە بکات، نەك لە لاوازییەوە.

*ئەو کەسەی کە ناتوندوتیژی بەکاردەهێنێ هەوڵ دەدات تەشەر لە کەسی نەیاری نەگرێ، بەڵکو هەمیشە هەوڵ دەدات لەناو ئەو کەسانەدا کە لە دژیان خەبات دەکەین ئەو تایبەتمەندییانە

بدۆزێتەوە کە (کویکەرز) پێی دەڵێت (تایبەتمەندێتی خودا).

*هەرچی لە توانامانداهەبێت دەیکەین بۆئەوەی ئەو کەسانەمان خۆش بووێت کە لەگەڵیاندا لە کێشەداین. هەموو ئەم بنەمایانە بە قسە ئاسانترن لە کردەوە. باشە چۆن ئەو خاوەن کارەمان خۆش بوێت کە فەرمان بە خەڵکانێکی گێل دەدات لەو کرێکارانە بدەن کە مانیان لە کارکردن گرتووە؟ یان چۆن حکومەتێکی وەك ئەو حکومەتەی خۆمانمان خۆشبوێت کە لەناو خاکە دوورەکاندا خەڵك دەکوژێت؟ چۆن ئێمە بە بێ ترس بین لە کاتێکدا کە گەردنمان لە ترساندا بلەرزێ؟ چۆن ڕاستگۆ بین لە کاتێکدا کە داننان بە هەڵەدا وامان لێدەکات گەمژە دەربکەوین؟

## لە کێشەدا هیچ وەڵامێکی ئاسان و ڕەها نییە

هیچ وەلآمێك نییە ئامادە بێت. لە سەردەمی جەنگی جیهانیی دووەمدا، لە شوێنانێکی وەك هۆڵەندە کە لەژێر داگیرکاریی نازیدا بوون، دەبێ چ وەلآمێکی (ڕاست و پاك) بدەیتەوە لە کاتێکی وادا کە زەلامەکانی (گەستاپۆ) لە دەرگاکەت بدەن و پرسیاری ئەوەت لێبکەن کە ئایا هیچ جولەکەیەکت لە ماڵەکەتدا داڵدە داوە؟ و تۆش دەزانیت لەژێر سەقفەکەتدا جولەکەیەکت لایە؟ ئومێدمە وەلآمەکەت ئەمە بێت (نەخێر، داڵدەی هیچ جولەکەیەکمان نەداوە). ئەمەش لەبەرئەوەی کە ئەو (بەها ڕەها)یەی کە لێرەدا دەیدەینە ژیانی هەر مرۆڤێك ناکۆکە لەگەڵ (بەها ڕەها)کەی وتنی ڕاستیدا. لێرەدا ژیانی مرۆڤایەتی سەرکەوت، چونکە هەندێ کات هەیە (حوکمڕەهاکانیش ناکۆك دەبن) هەروەها کاتگەلێکی تریش هەن تێیاندا بە ڕاستی (ڕاستگۆیی) واتە ئامادەیی ئێمە دەردەکەوێ بۆئەوەی زۆر گەمژە دەربکەوین. (فەڵەکان دەتوانن ڕێز لەو قسەیەی قەشە پۆڵس بگرن کە (ئامادە بووە لە پێناوی مەسیحدا ببێتە گەمژە) لە سەرەتای پەنجاکاندا پشێوییەکی زۆر

تـالْ لــه نێــوان حزبــی سۆشیالیســت و حزبــی کۆمەنســتدا هــەبوو (مــرۆڤ دەتوانێــت کتێبێــك لەســەر ئــەم بابەتــە دابــنێ) کۆمەنســتەکان بــە مەبەستەوە پلانی دزەکردنە ناو گروپەکانی ئێمەی دادەڕشت و هەوڵیان دا ڕێبەرایەتیی گروپەکانمان بگرنـە دەسـت). ئەوکاتــە هەرکەسـێکی ئێمــە لــە زانکۆی لۆس ئەنجلس (کە ئەم شتە ڕوویدا) کاری کردبێ ئاگادارییەکی باشی لەم مەسەلەیە هەبووە. لـە سـەردەمی خـەباتی دژی مـەکارتێتیدا گروپێکـی لاوانــی حزبــی سۆشیالیســت و لقێکــی لاوانــی (برایانی سوڵحکردن) پـەیمانیان بەست کـە لەسـەر ئاسـتی ویلایەتەکـە کۆنگرەیـەك لەســەر ئازادییـە مەدەنییـەکان ڕێك بخـەن کـە لـە کلێسـایەکی لـۆس ئەنجلس سازبدرێ.

ئەزموونــەکانم لەگــەڵ کۆمەنســتەکاندا بــەرەو بارانۆیایــەکیان بــردم: خــەیاڵێکی وام کــرد کــە کۆمەنستەکان هـەوڵێك بدەن لەمپـەر بخەنـە پێـش کۆنگرەکـە، یـان خۆیـان ڕێبەرایـەتیی بکـەن، بۆیـە هەســتام و جــاڕی ئــەوەم دا کــە کۆمەنســتەکان دزەیـان کردۆتــە نێوانمانــەوە، بۆیــە پشــوویەکی

کـورت وەردەگریــن بۆئــەوەی ڕیزەکانمــان یــەك بخەینــەوە، ئـەمجا سـەرلەنوێ کۆنگرەکـە دەسـت پێبکەینــەوە، ئــەوەبوو هــەر لەســەر شۆســتەیەك کۆڕێکی بە پەلەمان گرت و گەڕاینەوە ژوورەوە، لـە پێشکەشــکردنی کارنامەکــەدا پەلــەمان کــرد و گفتوگۆکـەشمان کـورت کـردەوە. پـاش ئـەوە بـە کاتێکی کەم زانیم کە تەنها یەك کەسی کۆمەنست لـەوێ بووە. ئـەو پلانـە زادەی خـەیاڵی خـۆم بـوو. ترسێك دایگرتم، چونکـە قسـەیەکی بـێ بنـەمام بـۆ ئـەو کۆمەنستانە هەڵبەست کە خۆیان بە ڕاسـتی لەبـەر ڕاوەدوونـانی یاسـاییدا بـوون. دوایــی کــە نامەیــەکی پـۆزشــم بــۆ هــەموو ئامــادەبووانی کۆنگرەکە نووسی و تێیدا دانم بـە هەڵەکـەمدا نـا، هاوڕێکانم لـە حزبـی سۆشیالیسـت، ئەوانـەی کـە لەســەر برینــەکانی ئــارامگربوون بەرامبــەر بــە ئاشتیخوازییەکەی من، بەڵام لەو بڕوایەدا بوون کە شــوێنەواری شــتێکم پێوەیــە. وا دەزانم لــەناو حــەرەمی زانکــۆدا نامەکــەم بەدەســت بەســەر ئەندامــەکانی حزبــی کۆمەنســتدا دابەشــکرد (و ئەوانیش هەر بە گومانلێکراو لێم تێدەگەشتن) ئـەم

ئامادەییە بۆ داننان بە هەڵەدا ئەگەر وا ڕێك بكەوێ كە ئەستەم بێت و زۆر شەرمهێنیش بێت متمانەی ڕاستگۆیی بە مرۆڤ دەبەخشێ، ئەمەش زۆرجار وات لێدەكات گێل دەربكەویت، بەڵام دەبێ ئەو موجازەفەیە بكەیت، چونكە پێویستە بزوتنەوەكەی ئێمە بزوتنەوەیەك بێت نەزانێت درۆ چییە!

هەروەها پێویستە بزوتنەوەیەكیش بێت ئۆپۆزسیۆنەكانمان نەكات بە شەیتان. ئەمەش زۆر ئەستەمە هەمووومان شكستی تێدا دەهێنین. لەو بڕوایەدام كە (هێنری كیسنجەر) تاوانبارێكی جەنگە و دەبێ لە دادگایەكی نێودەوڵەتیدا دادگایی بكرێ (دیارە ئەویش تاكەكەسی ئەمریكی نییە كە ئەم حوكمەم بیگرێتەوە، بەڵام ئەوم بە بیردا هات) لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بەهانەی ئەوە بهێنمەوە كە تاوانبارە ئاساییەكانیش مرۆڤن، ئیتر چۆن پلاری ئەوە لە كیسنجەر بگرم؟ هەروەها ئەگەر من بەهانەی ئەوەم هەبێ كە زیندانەكان سوودێكی زۆر زۆر كەم نەبێت نیانە، ئیتر چۆن ئاوا سەوداسەری ئەوەبم كە ئەو بە

زیندانیکــراوی ببینــم؟ ئەوانــەمان کــە شــەڕی ڤێتنامیـــان کـــرد، ئـــەوانیش کـــە هـــەندێکی هاوڕێکانیان خۆیانیان کوشت، یان بە خواردنـی ژەمێکی زۆری بەنج مردن، یان زۆرتریـن سـالآنی تەمـــەنی گـــەنجیی خۆیانیـــان لـــە زیندانـــدا بەسەربرد..و هتد ئەستەمە لەو مافانەیان خـۆش بن، خۆ ئەگەر لێخۆشبوون بەو ئاسانییە بوایـە پێویســتی نـــەدەکرد هـــەبێ (ئەگـــەر بەدەســـت گرفتێکـەوە نـالآندت، بـیر لـەوە بکـەرەوە کـە ڕەشپێستەکان لە کۆمەڵی ئێمەدا هەست بە چـی دەکەن؟).

بە دیدی ئێمە هەرگیز پۆلیسەکان بەراز نـین، لەوانەیە (لەوانەی کەم) ئەوانیش سەبارەت بـە درندەییەکـەیان بکەونـە بـەر زیندانیکردنـەوە و لێپرسینەوەی دادپەروەرییـەوە، بـەلآم ئـەوانیش مرۆڤن و هەرواش دەمێننەوە. هیچ مرۆڤێك نییـە شایانی ئەوە بێ پێی بوترێت سەگ– چ کیسنجەر بێت، یان ستالین، یان پۆلیسێکی خراپ، یـان کەسێکی کۆمەڵکوژ، یان پێی بوترێت بەراز، یان جـرج. چونکـە ئەمـە بـە شـێوەیەکی لاوەکـی

نـاڕەواییکردنێکی سـەبارەت بـە مـافی سـەگ و بـەرازو جرجـەکان تێدایـە، بـەڵام بـە شـێوەیەکی سـەرەکی لەبەرئـەوەی لـەناو ئەوانـەدا کـە ئەمـە دەخوێننـەوە کەسـێکتان نییـە (ئەگـەر لـە ڕووی پاشـەڵ و بارودۆخیشـەوە بـێ) ئەگـەری ئـەوەی نـەبووبێ ببێتـە پاسـەوانێك لـە سـەربازگەیەکی مەرگی نازییانەدا. ئێمە کاتێك دەڕوانینە مرۆڤێك کە ئەو پتر لە هـەر کەسێکی تـر ئاسـان بێـت بـە لامانـەوە ڕقمان لێبێت، ئـەوا ئێمـە لـەودا سـەیری خەسڵەتێك دەکەین کە لە خۆماندا هەیە.

ئامۆژگارییـەکی باشـم لا نییـە سـەبارەت بـە چۆنێتیی زاڵبوون بەسەر ترسدا پێشکەشی بکەم، تەنها ئەوەندە نەبێت کە بزانن من شکستم هێنا. تاکـە ئامۆژگارییـەك کـە بتـوانم لـە ئـەزموونی تایبەتیی خۆمەوە پێشکەشی بکەم ئەوەیە کە ئێوە پێویستە بە کارێك هەڵنەسن تا دڵنیا نەبن لەوەی دەتوانن ئـەنجامی بـدەن، لـەوە بـەولاوە چیدیکـە نییە، ئەگەر خانوویەك لە دووقات بەرزتربێت من نـاتوانم بەسـەر لێـواری دیوارەکـەیدا بـڕۆم، دە کەواتە هەوڵ بۆ ئەوە نادەم. بەڵام تەنها ئەوەندە

هەیــە کــە لــە ســاڵی (1978)دا لــە نــاڕەزایی دەربڕینێکی (کۆمەڵەی ئاشتبوونەوەی جیـهانیدا) لە تەنیشت (نۆرما بیکـیر و جـێری کۆڤین و بات لیسفێڵد و ستیڤ سەمەرفۆرد و سکۆت هـەرریك و کریگ سیمۆن)ەوە بە گۆڕەپانی سووردا تێپەڕیم. لەوانەیـە گـەورەترین کـارێك کـە پێویســتی بــە ئازایـەتی هـەبووبێت و مـن کردبێتـم ئـەوە بووبـێ. ئەوکاتە وامدەبینی کە هەر پێیەکم هەڵبهێنایەتەوە ئیـتر بـەرەو پێشــەوە بـۆ گۆڕەپانەکـە دەڕۆشـتم. ســەبارەت بــە ئــازایی ڕاســتەقینە چــی دەربــاری (خاتوو فیکی ڕۆڤێری بڵێین کە لە ساڵی (1968)دا بــە خۆبەخشــی چــووە نــاو ئــەو تیمانــەوە کــە (ڕێکخراوی نێودەوڵەتیی بەرەنگاریکردنی جەنگ) بــۆ نــاڕەزایی دەربڕیــن لـــە دژی داگـــیرکرانی چیکۆســـلۆڤاکیا ناردییـــە مۆســـکۆ و چـــەند پایتـەختێکی تـری ئـەوروپای ڕۆژهـەڵات. فیکـی کوڕێکی هاوڕێی ئینگلیزی هەبوو، بڕیار بـوو لـە مۆسـکۆ بـە یـەك بگـەن، کـەچی لـەوێ نـەیتوانی بیدۆزێتەوە. (لە ڕاستیدا ئەویش لەوێ بوو، بەڵام فیکی ئاراستەکانی لێ تێکـەڵ بـوو). بـەم شـێوەیە

فیکی خۆی بە تەنها ئالآی خۆیی هەڵدا و تا نەگیرا لە شوێنی خۆی نەجوولا.

لە هەموو بارێکدا ئەو شتانە بکە کە دەتوانیت بیانکەیت، نەك ئەوانەی کە ناتوانیت بیانکەیت. خۆ ئەگەر بەخت یارت بوو، دەبینی لە جاری داهاتوودا دەتوانیت شتێك بکەیت کە لە یەکەمجاردا نەت توانیبوو بیکەیت.

## بزووتنەوەکە پێویستی بە ترسنۆکەکانیش هەیە

بزوتنەوە ڕادیکاڵییەکە -سۆشیالیستییە- ئاشتیخوازە- فێندەمیتاڵییە- و پێویستی بە ترسنۆکەکانیش هەیە، پێویستی پێیانە لەبەرئەوەی خەڵکانی بووێر بوونیان لەم ڕۆژانەدا کەمە- لەوانەیە ژمارەکەیان بەشی ئەوە نەکات شۆڕشێك بەرپا بکەن. لەسەر بزوتنەوەی ناتوندوتیژیش، وەك هەر بزووتنەوەیەکی بەهێز پێویستە کە بوار بۆ ئەوانەمان برەخسێنێت کە بوێریی تەواومان نییە. لە چاکییەکانی ناتوندوتیژی ئەوەیە کە ئەگەر تۆ لاوبیت، یان پیر، یان لاواز و نەخۆش و ترسنۆك دەکرێ ئامرازێك

بدۆزیتـەوە پێـی بێیتـە نـاو ناتوندوتیژییـەوە – ئەمـەش وا لـە بزوتنەوەکـە دەکـات ببێتـە بزوتنەوەیـەکی دیموکراسـی. بـوارم بـدەن لـێرەدا شـتێك بـاس بکـەم کـە زۆرجـار لـە ژمـاردنی ئـەو جارانـەدا کـە تێیـدا دەسـتگیر کراویـن، لـە یـادی خۆمانی دەبەینەوە.. پێویستە هەریەکەمان منالێك بهێنینـە ئـەم دنیایـەوە، پـتر لـەوەی کـە پێویسـت بکات زیندانی بکرێین، منـالێك بهێنینـە دنیـاوە و گرنگیی پێبدەیـن و خۆشمـان بوویـت، بـە ئـازایی بێـت (یـان بـە گـەمژەیی) چونکـە باوکـان پـتر لـە کەسانی تر بوێر دەبن.

ئەگـەر ئـەوەمان لـەیاد بـوو کـە ئێمـە پێویسـتە هـەوڵ بدەیـن ڕاستگۆ بین و بوێرانـە هەڵسـوکەوت بکەین، ئەوا لە نهێنیدا شتێك ناکەین کە بە ئاشکرا نەتوانین بیکەین، شتگەلێك ناکەین کە ئامادە نەبین بە سەریانەوە نهێنگر ببین. لێرەشدا موفارەقەیەك هەیە: ئایا ئەمە ئەوە دەگەیـەنێ کە کاتگەلێکی وا هەبن پێویست بکات تێیاندا بە نهێنی کاربکەین؟ بەڵێ، منیش هەوڵم داوە هەمیشە پـێ لەسـەر ئەوە دابگـرم کـە ناکۆکییـەکان لـە ئـارادان. بـۆ نموونـە

ئەگەر هەوڵت دا کۆمەڵە ڕێسایەك بۆ ناتوندوتیژی دابنێیـت، ئـەوە ڕاسـتەوخۆ ڕووحەکـەیت پێشـێل کردووە و هەموو شتێك کۆتایی دێ. ناتوندوتیژی سەماکردنە لەناو ئاژاوەدا بەدڵخۆشییەوە.

### ئەی خۆشەویستی؟

یـەکێکی ئـەو شتانەی کە (ئیگـاڵ ڕۆدینکـۆ)ی ڕەحمەتی کردبووی بە خوو دەیوتـەوە ئـەوە بـوو دەیوت (من پێویسـتە لـە سـەرم هـەموو مرۆڤێکـم خـۆش بووێـت، بـەڵام سـوپاس بـۆ خـوا ناچـاری خۆشویستنی هەموو کەس نیم) خەڵکانێك هەن بە بینینیان دڵمان دەکرێتەوە و خەڵکانێکیش هەن کە ئاواتمانە تەلەفۆنیشمان بۆ نەکـەن. خۆشـەویستی قورســـە و زۆر جـــۆری خۆشەویســـتیش هەیـــە. خۆشەویستی هەیە کە پەیوەندیمان بەوانەوە هەیە کـە ئالوودەیـان دەبـین، وەك ئـەو منداڵانـــەی کـــە دەیانهێنینـە دونیـاوە و خۆشمـان دەوێـن، بـۆ ئـەو ســـەگ و پشـــیلانەی کـــە ژیانیـــان لەگـــەڵماندا هاوبەشـە، بـۆ هـەندێك هـاوڕێ کـە بـە ڕاسـتی خۆشمـان دەوێـــن. بـــەڵام لـــە ژێـــرەوەی ئەمـــەدا

هەستکردنێك بە سۆز هەیە، وەك هەستکردن بەوەی کە ئاکامی هەموومان بەرەو گۆڕە، هەستکردن بەوەی کە هەموومان برسی و تینوو و ماندوو دەبین، بۆیە ئەگەر (ڕق)یشمان لە یەکێك بێتەوە، ئەم هەستە وامان لێدەکات لە بەرامبەریدا هەست بە خۆشەویستییەك بکەین، ئەو خۆشەویستییە وامان لێدەکات ئارام بگرین بەرامبەر ئەو ئازار و موعاناتانەی دەیانەوێ لە ناخمانەوە سەربکەن.

هەموو کەس توانای ئەوەی نییە ئەوە بکات، بەڵام بزووتنەوەکە هەرەس دەهێنێ ئەگەر بەلای کەمەوە یەکێکی سەرکردەکانی توانای نەبێ ئەوە بکات. (ئـ. ج. مۆستە) ئەوەی کرد، (دۆرۆسی) ئەوەی کرد (ڕۆزا لۆکسەمبۆرگ) ئەوەی کرد (مارتن لۆسەرکینگ ی کوڕ) (دیبس) (چێ) و (غاندی)ش. وا دەزانم کە (ماڵکۆڵم ئێکس)یش لەسەر ڕێگای ئەوە بوو کە کوژرا، منیش ئەوەم نەگوزەراندووە، بەڵام ئێوە دەتوانن بیگوزەرێنن. وا دەزانم بە کارکردن هەموومان دەتوانین بە دەستی بهێنین.

## یاسا و گروپەکە

ناتوندوتیژی لەگەڵ چەمکی بنەڕەتیی یاسادا ناکۆك نییە. من لەوەدا لەگەڵ مارکسیستەکان کۆکم کە (دەوڵەت لیژنەی ڕاپەڕێنەری چینی فەرمانڕەوایە) بەڵام وەك لەوانەدا کە ڕابوردن تێبینیم کرد جیاوازییەك هەیە لە نێوان (ناکۆکی و کێشەکانمان لەگەڵ "دەوڵەت"ی ئەبستراکت) و (هەستی ئەندامێتیمان بۆ ئەو گروپەی کە هەموو هەوڵی بۆ دەدەین).

ئەگەر ئێمە بۆمان ڕێك بکەوێ یاساکانی دەوڵەت پێشێل بکەین، ئەوا ئێمە ئەوەش لە کایەی هەستکردنێکی قووڵ بە یاسادا دەکەین، هەستێك کە بە شێوەیەکی فراوان سەراپای گروپەکە بگرێتەوە. بەڵێ.

هەندێکی یاساکان هەڕەمەکییانەن. ئێمە لەبەر تیشکی سووردا دەوەستین و لەگەڵ تیشکی سەوزیشدا دەڕۆین، چونکە ئەوە شتێکە هەرچەند ئێمەش پێشێلی بکەین هەر بڕیارێکی ئەسڵییە. بەڵام بە هەمان ئاسانی دەکرا ڕەنگەکان بە

پێچەوانەشەوە بوونایە. بۆ نموونە لە بەریتانیا ئۆتۆمبێلەکان بەلای چەپی شەقامدا دەڕۆن، کەوابێ ئەو ڕۆشتنەی لێرە نایاسایيە لەوێ دەبێ بە یاسایی. چونکە هیچ لایەك لە لاکانی شەقام (دروست و ئاکارییانە) نین بۆئەوەی پێویست بکات بەو ئاراستە بئاژوێی، بەلاّم لە پێناوی پارێزکردن لە ڕوودانی کارەساتی ڕێگادا پێویستە هەموومان پەیڕەوی لەوە بکەین کە لەسەری ڕێککەوتووین. ئێمە لەو ولاّتەی خۆمان ئۆتۆمبێلەکانمان بەلای ڕاستی شەقامدا دەئاژوێین.

## دەڵەکە بەرەڵاکراوەکان

چەند مانگێك پێش ئێستا ژمارەیەك لە لایەنگرانی ئازادیی ئاژەڵان لە بەریتانیا ژمارەیەك دەڵەکیان ئازاد کرد کە بۆئەوە دایل کرابوون لە فەروەکانیان چاکەت دروست بکرێ. ئەمە کردەیەکی گەمژانە بوو، چونکە لەوانەیە کە دەڵەکەکان کەوتنە هەڵپەی دابینکردنی خۆراکی خۆیان بچن پیشیلە ماڵییەکان بخۆن، و ببنە هۆی شێواندنی زنجیرەی ژیانی دەشتەکیی سروشتی

لەو ناوچەیەدا کە تێیدا ئازاد کراون. ئەم کارە تەنها لەو مانایەیدا ناتوندوتیژییە کە کوشتنی مرۆڤی لێنەکەوتەوە، بەڵام نمونەیەکی ئەو کارانە بوو کە وەك ناتوندوتیژی دەردەکەوێ بەڵام ڕەگەزێکی سەرەکیی تێدا فەرامۆش دەکرێ. لەو دەستەیەی ئەو کارەیان کرد یەك کەسیان ئامادە نەبوو بەرامبەر بە دادگا ڕاوەستێت و بڵێت (هەستم بە ویژدانم کرد بانگم دەکات بۆ ئازادکردنی دەڵەکەکانتان- ئەوە منم. بمگرن).

بەڵکو لە بری ئەوە هەموو ئەوانەی دەڵەکەکانیان ئازاد کردبوو هێندە لە (ڕاستی)ی مەسەلەکەیان دڵنیابوون هیچ کام لەو هەنگاوانەیان نەنا کە (ناتوندوتیژی) بە پێویستیان دەزانێت. دیداری (پەروەردەکارەکانی دەڵەکەکان)یان نەکرد بۆئەوەی ڕێکەوتنیان لەگەڵ بکەن، پێشیان نەوتن ئەگەر پەروەردەکردن و سەربڕینی دەڵەکەکان بەردەوام بێت ئەوانیش لەو کارەیان بەردەوام دەبن، بێگومان پاش ئەوەی ئاژەڵەکانیان بەردا لە پێشچاویش ون بوون. ناتوندوتیژی مانای ئەوە نییە ئێمە لەبەرئەوەی

تەقە لەوانە ناکەین کە بۆچوونمان لەگەڵیان یەك نییە ئیتر بۆ تۆڵەکردنەوەی ئاکارییانە سەرپێچی لە یاسا بکەین.

## سوقرات و یاسا

سوقرات وەك نمونەی کەسێك دەمێنێتەوە کە گروپەکەی خۆشویستووە و گرنگی سەروەریی یاساشی سەلماندووە، هەروەها ئەوەشی سەلماندووە کە چەند کاتێك هەن پێویستە تێیاندا ویژدانی مرۆڤ ناکۆك بێت لەگەڵ ویژدانی دەوڵەتدا، و کاتێکیش ناکۆکییەکی وا بێتە پێشەوە، ئەوا (پاراستنی) گروپە کە هەر بە ئەوەندە نابێ کە سەرپێچی یاسایەکی ستەمکار بکەیت، بەڵکو دەبێ ئامادە بیت (گیان کێشانیشت) پەسەند بکەیت (وەك ئەوەی کە سوقرات شەرابە "شەوکران"ە کوشندەکەی خواردەوە) شیاوی باسە سوقرات دەیتوانی هەڵبێت، ئەوانەشی کە حوکمی لە سێدارەدانیان دابوو بە سەریدا گریمانی ئەوەیان دانابوو کە هەڵدێت، بەڵام کە قایل نەبوو هەڵبێت تاوانی

بڕیــاری کوشــتنەکەی خۆیــی دا بەســەر ئــەو کەسانەدا کە دادگاییان کردبوو. بەو کارەی دوو شتی ڕەت کردەوە:

1–پەسەندکردنی یاساکانی ئەوان.

2–هەڵاتن لە بەر سزا.

مەسیحیش چووە بەر ئەم تاقیکردنەوەیە. ئەویش لە دژی سوونەتە وشکەکانی گەلەکەی وەستا و، درایە دادگا، لە دادگاش نە ئینکاری تۆمەتەکانی کرد و نە لە بەریان هەڵات، کرا بە دارا.

ئێمە نە سوقراتین و نە یەسوع. بۆیە ئەگەر بۆمان هەڵبکەوێ کە هەوڵ بدەین بۆ کاری چاکە (بەو شێوەیەی کە خۆمان لە چاکە دەگەین) و بۆ هەڵاتن لە گیانکێشان، ئەوا ئێمەش لە مرۆڤ بەولاوە چیدیکە نین.

مەبەستم لەمە ئەوە نییە کە بڵێم ئێمە گروپێکی دوو سەد کەسین و مژدەی پیرۆزیمان دەدەین، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە وا ناومان بهێنن کە ئێمە ناتوانین وا بە سادەیی هەڵسوکەوت بکەین کە گروپەکەمان بێمانا بێت. لە هەموو

گروپێکدا چ بە خۆی بڵێت مارکسیست، یان فێندەمینتاڵی، یان ئاشتیخواز و بێوەی خەڵکانێکی وا هەن پێ لەسەر ئەوە دابگرن کە خۆیان هێندە کامڵ و تەواون کە مافی ئەوەیان هەیە ڕەگەزە هەرە بنچینەییەکانی کۆمەڵگەش فەرامۆش بکەن. تراژیدیانەترین نموونەی ئەمانەش لەناو دەستەیەك خەڵکی ناو بزوتنەوەی (مافی ژیان)دا دەبینینن، ئەو دەستەیە وا هەست دەکەن بەهانەی کوشتنی ئەو پزیشکانەیان هەیە کە (پرۆسەکانی لەباربردن) ئەنجام دەدەن.

هەرچەند وات بینی کە (ڕاستی تۆ) هێندە قووڵە کە وا بزانیت لەناو هەستی گروپەکەدا تۆ ناوازەیت، و لە ناتوندوتیژیتدا بەرامبەر ئەوانیتر لەناو گروپەکەتدا ناوازەیت، ئەوە بزانە کە تۆ ڕێگەت چەواشە کردووە. چونکە کاروکردەوەکان تەنها لەبەرئەوە ناتوندوتیژی نابن کە چەك بەکارنەهێنی، ناتوندوتیژی زۆر لە (نەبوونی توندوتیژی) قووڵترە. ئەو دایکەی کە لەسەر شەقامێکی قەرەباڵەغ بە هاتووچۆدا منداڵەکەیی لە دەست دەردەچێت و ڕادەکات، کە دەیگرێتەوە

زللەیــەکی لێــدەدات، زۆر کــەمتر لــەو دایکــە توندوتیژتـرە کـە بـە سـاردییەوە حـەزی سـزادانی منداڵەکـەی لەسـەر هـەمان کـردەوە دەشـارێتەوە ناتوندوتیژی زۆر لە (ڕەتکردنەوەی لێدان) زۆرترە. درێژکردنـی دەسـتتە بـۆ کەسـی نـەیار، بێگومـان ئەسـتەمترین شـتی مەسـەلەکەیە. چونکـە بـەلای هەمووانـەوە ئـەوە شـتێکی بێئـەندازە ئاسـانە کـە نەیارەکەمان بکەین بە شەیتان. خۆ ڕەنگە ئەو بە ڕوانینـی ئێمـە (نۆت گـەنگریچ) بێت و بـە ڕوانینـی خەڵکانی تر (کینس ستار) بێت، لە باربەرەکان لە کـاتی جیـاواز جیـاوازدا جولەکـە بـوون، ڕەش، و کۆمەنست و لۆتی و خەڵکی پووچ بوون.

## ئەستەمترین شتی مەسەلەکە

بـوارم بـدەن جـەخت لەسـەر ئـەم خاڵـە بکـەن: ئەسـتەم و ناڕەحـەتترین شـت لـە نـاتوندوتیژیدا پێشێلکردنی یاسا، یـان چوونـە نـاو زینـدان نییـە، بـەڵکو سـووربوونە لەسـەر مرۆیـی بوونـی بەرهەڵستکارییەکەی ئێمـە. نـاتوندوتیژی لـە یـەك کـاتدا بینینـی ڕووی ڕاسـتەقینەی ئەوەیـە کـە

ڕەگەزپەرستی (ڕاسیزم) یان سەرمایەداریی ئەمریکایی چی دەکەن (و کۆمۆنیزمی شورەویی) چی کردووە، سەرباری ئەوەش بینینی نەیارەکەمانە وەك بەشێك لە خێزانەکەی خۆمان. ناتوندوتیژی توانایەکە بۆ ساغکردنەوەی هەستکردن بە (گروپە خۆشەویستەکە) دیارە ئەگەر هەستان بەو کارەش ئاسان بووایە، مەسەلەکە هێندە گرنگ نەدەبوو. بەڵام دیارە زۆر ئەستەمە، و لە کۆمەڵگەی هەڵوەشاوی ئێمەشدا کە کەسمان ئەوی ترمان وەك مرۆڤ نابینێت، بەڵکو وەك ئەو کەرت و پارچانە دەیبینێت کە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن، یان ئینتەرنێت گواستونییەتەوە، کارێکی لەوە ئەستەمتر نییە. ئایا پێویستە ئێمە (بێنۆشێ)مان خۆش بووێت؟ بەڵێ. ناچار نین خۆشمان بووێت، بەڵام پێویستە هەرگیز ڕقیشمان لێی نەبێتەوە. لەوانەیە پێویست بێت بەوە دڵخۆش بین کە گیراوە و دەدرێتە دادگا (هەروەها دەتوانین ئومێدی ئەوەش بکەین کەسێك هەبێت کیسنجەر بدات بە دادگا) بەڵام پێویستە بیر لە هەستی منداڵەکانیشی بکەینەوە، و هەست

بکەین ئەو، کە خۆی لەژێر قورسیی ئەو هەموو تاوانە ستەمکاری و ترسناکانەدا دەناڵێنێ، ئەو تاریکییەشی ئاشکرا کردووە کە لە ناخی هەریەکەماندا حەشار دراوە.

ڕوونکردنەوەیەك بۆ ئەم خاڵەی دوایی: کاتێك کە بیر لەوە دەکەینەوە کە لە پشتی تاوانەکانی توندوتیژی دژی نێربازەکانەوە چی حەشار دراوە، دەبینین لە لای ئەو کەسانەی کە دەستدرێژییان دەکەنە سەر ترسێکی ئەوە هەیە کە خۆیان نەشازی سێکسی بن، زۆر جاریش وا هەڵکەوتووە کە خۆیان پەیوەندیی سێکسی نەشازیان هەبووە، بۆیە هەرچەند تووڕەیی پیاوێك بەرامبەر بە (ناوزڕاوەکان) توند بێت، ئەوەندە گریمانی ئەوە بەرز دەبێتەوە کە لە ناخی خۆیدا دژایەتیی ئەو خووە لە لای خۆیشی بکات.

بۆیە هەرچەند تۆ دڵنیایت لەوە زیادی کرد کە (بێنۆشێ) کەسێکی بێوێنەی ناو هاوچەشنەکانی خۆیەتی، و ئارەزوو بکەیت پێشی ڕێزی خەڵك بگری بۆئەوەی بە تێلایەك لێی بدەیت، ئەوا

گریمانی زالْ ئەوەیە کە تۆش (بێنۆشێ)یەکی بچوکت تێدایە.

یەکێکی ئەو مەسەلانەی بزوتنەوەی ئاشتیخوازیی ئەمریکی لە (غاندی)ی وەرنەگرتووەو بزوتنەوەکەش زۆر پێویستی پێیەتی ئەو قەناعەتەی غاندی بووە کە کاری سەرەکیی بزوتنەوەکەی هەڵمەتە (ناتوندوتیژی)یەکانی بەرەنگاریکردن نەبووە، بەڵکو ئەو (پرۆگرامە بونیاتنەرانە) بووە کە خۆی دایناوە. لە وڵاتی ئێمە و -لە ڕۆژئاواشدا بە گشتی- نۆکەندێکی دڵتەزێن کەوتۆتە نێوان بەرەنگاریی ناتوندوتیژی و پرۆگرامی پۆزەتیڤەوە.

غاندی لە خەباتی خۆیدا لە پێناوی سەرکەوتن بەسەر بەریتانییەکاندا زۆر هەڵمەتی بەرەنگاریی سلبییانەی ئامادە کرد کە بەهای زۆر ناوەندییان هەبوو، وەك ئامرازگەلێکی بنچینەیی داینان، بەڵام ئامانجە سەرەکییەکەی نەبوون. بوارمان بدەن ئاماژە بە فاکتەرە سەرەکییەکانی بدەین بە بێ ئەوەی ناچار بین مێژووی بزوتنەوەکەی غاندی

نمایش بکەین. غاندی مامەڵەی لەگەڵ خەڵکانێکی جوتیـاردا دەکـرد کـە خوێندەواریـی سـەرەتایی و ڕاژەگوزاریــی تەندروستیشــیان نــەبوو، هــەروەها مێژوویەکی واشیان نەبوو کە بە تەنها لـە پێنـاوی بەرژەوەندیی خۆشیاندا کاریان کردبێ.

بۆیــە غــاندی هــات پێــی لەســەر فــێرکردن و نەهێشـــتنی نـــەخوێندەواری و ڕاژەگوزاریـــی تەندروســتی و ئامۆژگارییــەکانی تەندروســتیی گشتی داگرت، هەموو ئەمانەی لەسەر ئاستی لادێ کرد. ئەگەر سەرکەوتنی کۆمەنستەکان لە ڤێتنـام بپشــکنین هــەمان نمونــە دەبینینــەوە، لــەوێش خـــەباتی ســـەربازی هێنـــدەی نـــاوەندیبوونی هەڵمەتەکانی (ساتیاگراها)ی غاندی ناوەندی بوو. کۆمەنستەکان چوونە گوندەکانی ڤێتنام و لەوێ لە قـەلاچۆکردنی نـەخوێندەواری و پێشکەشـکردنی ڕاژەگوزاریـــی تەندروســـتیدا کاریـــان کـــرد و هەستکردن بە کەرامەتیان بەخشی بە لادێییەکان. ئـــەوەش شـــێوازێکی خـــەباتی -توندوتیـــژ و نـــاتوندوتیژیش بـــوو، جیـــاواز بـــوو، بـــەلام

ســـووربوونێکی وەك ئـــەوەی غـــاندیی لەســـەر (بەرنامەی بونیادنەرانە) تێدا نەبوو.

کەواتــە ئایــا بەرنامــەی بونیادنەرانــەی ئێمــە چییــە؟ ئێمــە بــە مســۆگەری لــە ڕەتکردنــەوە و لــە ناڕەزایی دەربڕینماندا کارێکی باش دەکەین، بەڵام کــوا ئــەو بەرنامــە بێوەییــە ئاشــتیخوازەمان کــە بتوانێـــت (هەســـتکردنێکی ئەڵتـــەرناتیڤ بـــە گروپەکە) بێنێتە ئاراوە؟

بزوتنـەوەی سۆشیالیستی لـەو ڕۆژگارەیدا کـە بزوتنەوەیـەکی جـەماوەری بـووە، چ لــە ئــەوروپا بووبێت، یان لێرە شتێکی کردووە کە زۆر لـەوەوە نزیك بووە غاندی لـە هند کردوویـەتی: (ئەوکاتـە ڕێکخستنی لاوانـی هـەبووە، پرۆگرامـی کـەلتوری هـەبووە، کەوانتـەری پاشـەکەوتکردن بـۆ قـەرزدان هـەبووە، بەرنامـە بـۆ بـە ساڵدچووان هـەبووە، بـە کورتـــی سۆشیالیســـتەکان لـــە ســـندووقەکانی دەنگدانــدا چــاوەڕوانی ســـەرکەوتنی خۆیانیـــان نەکردووە، بەڵکو لە پێشبڕکێی دامەزراندنی چەند ڕەگـــەزێکی (کۆمەڵگـــەی نـــوێ–دابـــوون) بـــە کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی خۆشیانەوە– هەر ئەمەش

بوو کە لە هندیش ڕوویدا)، ئەستەمە پێشبینی ئەوە بکەین کە ڕێکخراوێك (بۆ نموونە، کۆمەڵەی بەرەنگاریی جەنگ) بتوانێت بەرنامەیەکی پۆزەتیڤی وا دابنێت و پیادەشی بکات، بەڵام ئەوە ئەستەم نییە کە پێویستی بوونی ئەو بەرنامەیە هەست پێ بکەین.

## ئەفراندنی کۆمەڵگەیەکی نوێ.. لێرەدا و ئێستە

لەو ئەرکانەی کە بە (ڕاستی) لە سەدەی بیست و یەکدا کەوتوونەتە سەر ئەستۆی بزوتنەوەی ئاشتیخوازی بونیادنانی پرۆگرامێکەوە بۆ لاوان ("لاوانی ئاشتی" نمونەیەکی شیاوە بۆ ئەو خەونە) یان بونیادنانی کۆمەڵە ئامرازێکی ڕاستەقینەی ڕاگەیاندنە بەو شێوەیەی کە لەژێر بەزەیی سەرانی زۆربلێی سەر تۆڕەکان ئەمێنێنەوە.

زۆربەی کارەکەی ئێمە (دژایەتی) کردنە، دژایەتیی ڕەگەزپەرستی، دژایەتیی ئیمپریالیستی، دژایەتیی سزای لەسێدارەدان، دژایەتیی دەماری، دژایەتیی چەوسێنەرانی

بەسالاچووان، تەنانەت من وا دەزانم کە ئەگەر زۆرێکی خەڵك سەیرێکی کارەکانمان بکەن دەڵێن: (ئەی هاوار، کورە ژیان لەوە کورتترە من لەوەدا لە دەستی بدەم.. من بە دوای تۆزێك پشوو دڵدانەوەدا دەگەڕێم). بۆ غاندی ئەوە ئاسانتر بوو کە بەرنامەیەکی بونیادنەرانە پەرەپێبدات، چونکە لە خەباتەکەی خۆیدا لە دژی فەرمانڕەوایی بەریتانی هەوڵیدا "کۆمەڵگەیەکی ئەڵتەرناتیڤ" بدۆزێتەوە، بەو شێوەیەی کە لەناو قاوغی کۆمەڵگە کۆنەکەدا کۆمەڵگەیەکی نوێ بە قۆناغ و بە مەبەستەوە بکەوێتە پەرەگرتن. بزوتنەوەکەی غاندی سیستمێکی فێرکاریی ڕێکخست کە جێگەی ئەو سیستمەی گرتەوە کەبەریتانییەکان (بۆ کەمینەیەکیان) دابیندەکرد. هەروەها غاندی کۆی لە هەوڵدان نەدەکردەوە بۆئەوەی لەناو حیزبی کۆنگرەدا چەند دادگایەك دابمەزرێنێت بۆئەوەی هندییەکان لەوێدا کە هەست دەکەن لە کێشەکانیاندا پێویستیان بە دەروازەی یاسایی دەبێ کێشەکانیان بەرنە ئەو دادگایانە و دادگا بەریتانییەکان فەرامۆش بکەن.

لــەم ســـەردەمەی خۆشمـــاندا دانیشـــتووانە ئەلبانەکانی کۆسۆڤا کـارێکی وایـان کـرد کـە زۆر لــەو نمونەیــەی غــاندی دەچــوو، بــەڵام دوایــی هەڵچوونی توندوتیـژی (گلـەیی ئـەو توندوتیژییـە لەسەر هەردوولایە) بوو بە هۆی هەرەسـپێهێنانی دەستەڵاتی ئەم چێوە (ئەڵتەرناتیڤە). لە ڤێتنامیش ڤێتنامییەکان شتی زۆر زیاتریـان لـە پـەلاماردانی شـەڕی مەغاویریانە و(دابینکردنـی تەندروسـتی و فێرکردن) ئەنجام دا: باجیان کۆکردەوە، ئۆیندەیی نێوان کێشەکانیان کرد. بـە هـەموو ئـامرازێك کـە بۆیـــان بلوایـــە دەســـتەڵاتی ئـــەو حکومەتـــە ئەمریکییـــەیان وەلا دەنـــا کـــە لـــە ســـایگۆن دروستکرابوو. لەویّ لەوکاتەدا شتێك لە ئارادا بوو لـە سـەرووی ئـەوەوە بـوو ئەمریکییـەکان لێـی تێبگـەن، ئـەویش ئـەوەبوو کـە: کۆمەنسـتەکان فەرمانڕەوای فیعلی بەشێکی زۆر فراوانی باشوری ڤێتنـام بوون، ئەگـەرچی کـە هەمیشـە نەخشـەکان وایان پیشان دەدا کە لەژێر دەستەڵاتی سایگۆن و هێزە سەربازییە ئەمریکییەکاندا بێت.

## بۆچی کاری ئێمە لە کاری هند قورسترە؟

زۆر ئەستەمە کەسێك لە کۆمەڵگەیەکدا بژی کە لەژێر داگیرکاریی بێگانەدا نەبێ و دەستەڵاتی کۆمەڵگەکەش لەبەر ڕەوابییەکەی پەسەند بێ، ئەو کەسە پرۆگرامێکی بونیادنەرانەی وەك بەرنامەکەی غاندی (یان وەك ئەوەی کۆمەنستەکانی ڤێتنام) دابنێت، چونکە لە کوێ بینیت جەماوەر بە گشتی و بێ نووزە کەوتبووە قەڵەمڕەوی فەرمانی داگیرکەرێکەوە (وەك هند) یان کەوتبووە ژێر فەرمانی سوپایەکەوە کە هیچ پەیوەندییەکی پێوە نەبێ، و وەك هێزێکی بێگانە بیدۆزێتەوە و مەشقی پێ بکات (وەك ڤێتنام) ئەوا لەوێدا بە شێوەیەکی ڕێژەیی ڕێکخستنی ئۆپۆزسیۆنێك ئاسانە، بەڵام لەوێدا کە ئێمە جڵەومان بەدەست خۆمانە گرتن و دۆزینەوەی خاڵی هەیمەنە ئەستەمترە، کەوابێ ڕێکخستنی حکومەتێکی تەریبیش زۆر قورسترە. (وێزە ڕەشەکان "وێز ڕەگەزێکی پڵنگە-و-" لە هەندێ ناوچە شتێکی لەم شێوەیەیان کرد، بەڵام لەبەر چەند هۆیەکی جۆراوجۆر هەوڵەکەیان سەری

نـەگرت و شكسـتی هێنـا– مەسـەلەی چۆنییـــەتی چارەسـەركردنی گرفتـی ڕاسـیزمیش لـە ڕێگـەی تێكەڵ كردنەوە بێت، یان لە ڕێگەی جیاكردنەوەوە مەسـەلەیەكە لەبەر كـەمی بـوار دەیدەمـە لاوە. مـن خـۆم مـەیلم بـەلای تێكەڵكردنەكـەدا هەیـە، بـەلام بەهانـە هێنانـــەوەكان بۆئـەوە درێـژن و ئـالۆزن و لێرەدا جێگەیان نابێتەوە).

گرفتبوونــی ڕێكخســـتنی ئۆپۆزســـیۆن لـــەو شـوێنانەش هـەر گرفتـە كـە خـەڵك وا دەردەكـەون جڵەوی كارەكانیان بەدەست خۆیانە، وەك خـەڵكی ئـەوروپای سـەردەمی نـازیزم: لـە ئـەڵمانیا خـەڵك سـەرباری بێبـەری بوونیشـیان لەهـەر ئازادییـەكی ڕاستەقینە، بە چەشنێك دانیان بە هیتلـەردا دەنـا كـە فەرمانڕەوایـەكی شـەرعی بێـت. بـەلام لـەو ولاتانـەدا كـە نازییـەكان لـە ڕووی سـەربازییەوە بـــەزاندنیان و داگیریـــان كـــردن ڕێكخســـتنی هەرچەشـنە بەرەنگارییـەك ئاسـان بـوو، چونكـە هـەرگیز ئـەو حكومەتـە وابەسـتە و هاوكارانـەی نازییـەكان كـە هـــەر لـــە لایـــەن نازییەكانـــەوە سەپێنرابوون نەیانتوانیوە ڕەوایی بەدەست بهێنن.

دۆزینـــەوەی (بەرنامەیـــەکی بونیادنـــەر)ی ڕاستەقینە لێرەدا دەکاتە چوونە ناو (سیاسەتێکی ڕاســتەقینەوە) ئــەوەش لــە بونیادنــانی چــەند ئیتیلافێکــدا لەگــەڵ گروپــە جۆراوجۆرەکــاندا. هەروەها واش نازانم کـە چارەسـەرەکە لـە هـەوڵی دۆزینەوەی چەند کۆلۆنییەکدا حەشار درابێ کە لە دەرەوەی کۆمەڵگەکــەی ئێســتەدا بدۆزرێنــەوە– ئەگــەرچی پاڵنــەری ژیــانی بــە کۆمــەڵی لـــە شەسـتەکاندا زۆر کەسـی سەرمەسـت کـردووە، و مێژووی ئەو شتەش لە ڕاستیدا لـە وڵاتـی ئێمـەدا درێژ و شەرەفمەندانەیە. بەڵام کۆلۆنی لەو شێوەیە لەســەر ئــەوەی کــە ئەڵتــەرناتیڤێك بــەو خەڵکــە پێشکەش دەکات کە لەناو ئێمەدا دەژین، کۆمەڵگە وەك (گشت) ناگۆڕێت.

## لە بریی کۆتایی

بـوارم بـدەن لـەم چـەند بڕگەیـەدا کـە مـاون کۆتاییەك بۆ ئەم تێبینییانە دابنێم.

*ئومێدمە ئەو کەسانەی کە خوێندوویانەتەوە هەسـتیان کردبێـت کـە (نـاتوندوتیژی) وەڵامـی هـەموو ئاسـتەنگەکانی تێـدا نییـە، بـەڵکو وەك (بەرباره دمنـگ) دەڵێـت ئەزموونێکـە هـەر ئێسـتە دەستی پێکردووە.

*ناتوندوتیژی مەشقێکی ئەکادیمییانـە نییـە، مەسـەلەی خسـتنەگەڕی تیۆرەکانـە لـە بـواری پیـادەکردندا، پرسـیارکردنە دەربـارەی شـوێنی هەڵەکان و سەرلەنوێ هەوڵدانەوەیە.

*نـاتوندوتیژی تیۆرێکـە بـۆ سـەروکاریکردنی کێشەی کۆمەڵایەتی لە پێناوی هێنانەدیی گۆڕانـی کۆمەڵایـەتیدا لـە مـاوەی کورتـدا نـەبێ تیـۆری بەرپاکردنی ئاژاوەی کۆمەڵایـەتی نییە. توانایەکـە بۆئەوەی هـەموان بـە گشـتی لـە چێـوەی بـەزەیی بەرامبەر بەیەکدا بەیەکەوە بهێنی.

*ناتوندوتیژی گەڕانە بە دوای حەقیقەتدا. و گەڕان نییە بە دوای ڕێگەگەلێکدا کە بە هۆیانەوە هەڵەیی نەیارەکەت بسەلمێنیت. بۆیە ئەگەر ئامادە نەبیت لەو گەڕانەتدا بە دوای واقعەکاندا بکەویت بەسەر ئەوەدا هەست بکەیت کە لەوانەیە خۆت لەسەر هەڵە بیت و نەیارەکەت ڕەوا بێ ئەوا تۆ هێشتا کامڵ نەبوویت بۆ ناتوندوتیژی.

*پێویستە لەسەرت بە تیۆرەکانی خۆتەوە نەبەستڕێیتەوە، بەڵکو دەست بە دیسپلینەوە بگری.

چونکە دیسپلین تیۆرە. ئێمە بە ڕۆشتن ڕێگا دەدۆزینەوە. ئامانجەکان بە ئامرازەکان دەستنیشان دیاری دەکرێن و بە دابڕاوی و بە جیایی لەوان نین و نابن.

## دوایین دووخان

ناتوندوتیژی بە زەروری پێویستی بە ژنان و پیاوانێك هەیە کە ئازابن. بەڵام ئەگەر هەر پشتی بە ئازاکان بەست ئەوا شکست دەهێنێ. کارە ناتوندوتیژییەکان تاقیکردنەوەیەك نین بە

هۆیانەوە بزانیت چەند جار دەتوانیت دەستگیر بکرێیت، چەند جار دەتوانیت بەر لێدان بکەویت، و درێژترین ماوە چەندە کە دەتوانیت لە زینداندا بمێنیتەوە. دەکرێ هەریەکە لەم مەسەلانەش ڕوو بدەن (بەڵام ئەگەر توندوتیژیش بیت هەر دەکرێ ڕوو بدەن).

بەڵام ئامانجمان ژیانێکی باشە، ئامانجمان ئاسوودەییە، و پیرۆزکردنی موعاناتەکان نییە. ئێمە پێویستمان بە بزوتنەوەیەکە کە لەو خەڵکە ئاساییانە بن کە هەندێ جار دەتوانن بە ڕێگاگەلی نائاسایی خارق هەڵسوکەوت بکەن، پێویستمان بە خەڵاتکردنی ئەو کەسانە هەیە کە ناتوندوتیژییەکەیان کاریگەرترین جۆر و پڕتەحەدا ترین ناتوندوتیژییە. ناتوندوتیژی و سۆز و بەزەیی ئەو باوکەیە کە سەرکێشی بە هەموو شتێکەوە دەکات بۆئەوەی ژیانێك بە منداڵێك و پەروەردەکەی ببەخشێت. ناتوندوتیژیی ئەو مامۆستایەیە کە لەوانەیە هەرگیز زیندانی نەکرێ، بەڵام دەکرێ ژیانی ئەو وەك مامۆستایەك ژیانی زۆر منداڵ بگۆڕێ. پێویستە لە سەرمان

سەبارەت بە (دۆرۆسی دی) بیر لە ژمارەی ئەو جارە جیاوازانە نەکەینەوە کە تیایاندا زیندانی کراوە -و بە شێوەیەکی ڕێژەییش بەرگەی گرتن- بەڵکو پێویستە بیر لەوە بکەینەوە کە لە -بەرنامە بونیادنەرانەکەی خۆیدا خەڵکانی لانەوازی جێگە کردۆتەوە و نانی بە برسییەکانیش داوە.

لە نووسینی ئەم تێبینیانەدا دوودڵ بووم چونکە ژیانم تۆمارێکی پڕوپاڵەوانانە نەبووە و خۆشم هەست بەوە دەکەم. لە کاتێکدا کە پتر لە دوانزە جار دەستگیر کراوم پۆلیس بۆ یەکەم جاریش لێی نەداوم. ئەو ماوانەش کە لە زیندانندا ماومەتەوە کورت بوون، وەك ئەو ماوە دووردرێژانە نەبوون کە زۆر کەس تێیدا ماونەتەوە. من خۆم وەك کەسێکی (بیرۆکراسی ئاشتی) ئەوەم زۆر بەلاوە ئاسانترە کە (دەم پاراو) بم، پتر لەوەی کە لە پیشەیەکدا کاربکەم کە ئاشکراکردنی بۆچوونەکانم لەوانەبێ بکاتە دەرکردنم لە کارەکەم. کەواتە با ئێوەش بە حوکمی باشییەکانی نوسینەکە سەیری نوسینەکەم بکەن، نەك بە حوکمی باشییەکانی خۆم.

لـە نـاتوندوتیژیدا هەمیشـە پێویسـتیی ئـەوە هەیە کە خۆمان لـەو کەسـەدا ببینینـەوە کـە ڕقمـان لێیـەتی. لـە سـاڵی (1951)دا یەکـەم گەشـتمم بـۆ ئـــەوروپا بـــۆ بەشـــداریکردنی کۆنگرەیـــەکی ئاشـتیخوازەکان لــە دانیمـــارك کــرد. ئەوکاتــە گەشتەکەمم بـەناو ئـەڵمانیادا کـرد بـۆ گەشـتن بـە دانیمارك، لەوێش ئەو وێرانەیەم بینـی کـە شـەڕ لـە پـاش خـۆی بـەجێی هێشـتبوو. لـە هـامبۆرگدا چـەندین تـەلاری تـەواو لــە سـەنتەری شـارەکەدا لەگـەڵ زەویـدا تـەخت کرابـوون، داروپـەردووە ڕووخاوەکانیش گسك لێدرابوون و شوێنەوارێکی تـەلارەکان نـەمابوون (بـیرێکم کـردەوە: سـەیرە سـەنتەری شـارێکی وەك ئـەم شـارە دێرینـە ئـەم هەموو ڕووبەرە چۆڵەی تێدابێ! ئەمجا هەستمکرد کە سـەردەمێك پڕبـووە لـە تـەلار) ڕوانینـەکانم لـە سەرەتاوە تـەقلیدی بوون: ئـەم وێرانەیـە بـە هـۆی ململانـە ڕەواکـەی نێـوان نازییـەکان و ڕۆژئـاواوە دروست بووە. بەڵام لـە بریمـەن وێرانەکـە خراپـتر بوو، و هێشتا پاکیش نەکرابۆوە، کڵێسایەك ناپاڵم تێکـی شـکاندبوو، سـەقفەکەی پـەڕیبوو، لــە

ناوەڕاستی کڵێساکەدا و لەناو کورسییە پشتدارەکاندا کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کاردا و ئامادەبوون درەختێك قووت بووبۆوە.

ڕۆژگاری قوتابخانەی دواناوەندیی خۆمم یادکەوتەوە، ئەوکاتەی کە گرنگیی زۆرم بە ڕووداوەکان دەدا، هەرگیز ئەو مانشێتە سەرەکییانە لە زەینم دەرناچن: (یەك هەزار قونبەلەی ناپاڵم هامبۆرگیان کرد بە هامبۆرگر و شەش هەزار قونبەلە هاوێژیش بۆردومانی بریمەن دەکەن) (لە بۆردومانەکەی بریمەندا ئاگری دژە ئاسمانییەکان شەست قونبەلەیان تەقاندەوە بە ئاسمانەوە). ئەو ڕۆژگارە و ئەوکاتە ئەوانەم دەخوێندەوە لە قوتابخانە دواناوەندییەکە دانیشتبووم، باوکیشم لە هێزی ئاسمانیدا لە هیند بوو، بە خوێندنەوەی ئەو ناونیشانانە دڵخۆش دەبووم. ئەو ڕۆژەش خۆم لەوێ بووم، لە بریمەن بووم، لە ناوەندی ئەو داروپەردووانەدا کە ماوەیەکی کورت پێش ئێستە بە خوێندنەوەی هەواڵەکانی سەریان دڵخۆش دەبووم. ئەو ڕۆژە لە ناو یەکێك لە بۆردوومان کەرەکانی بریمەن بووم، و

شــتێکی واش لــە ئــارادا نییــە ئــەو خەڵکــە کردبێتیـانو بەهانـە بێـت بـۆ ئـەو هـەموو ئـاگر و بۆردوومانــە هەرەمەکییانــە بەســەر ماڵــەکانیاندا پرژێـنراوە و کوژرانـی جولەکـەکانیش لـە لایـەن ئەڵمانەکانـەوە بـە کوشـتنی ئەڵمانـەکان قـەرەبوو، یان ڕاست ناکرێتەوە. تەنها لەو کاتـەدا کە هەست دەکـەین ئێمــە دەتوانـین حەزبکـەین تـاوان ئـەنجام بدەین، ئەو کاتە و لە دواییـدا دەتوانـین بکەوینـە هەڵبژاردن و ئەزموونکردنی ئەڵتەرناتیڤەکە، بەڵام تا ئێمە وابـین کـەوا دادەنێـین خۆمـان نـاوازەین و هەرگیز ناکرێ بۆ ڕۆژێك پاسەوانێکی سەربازگەی مەرگ بین، کەواتە هێشتا گەشتەکەمانمان دەست پێنەکردووە.

*  *  *

**سەرچاوە:**

*لە ماڵپەڕی ئینتەرنێتی مەعابردا بە دوو زنجیرە بڵاوکراوەتەوە، من هەردوو زنجیرەکەم کردووە بە کوردی و لەم کتێبەدا کۆمکردوونەتەوە.

*نووسەری بابەتەکە (دێڤید مەکرینۆڵدز) ئەمریکییە و بە ئینگلیزی ئەم بابەتەی لەسەر فەلسەفەی بزوتنەوە ئاشتیخوازییەکەی خۆیان نووسیوە و خۆی کەسێکی دیاری ناو بزوتنەوەی ئاشتیخوازییە. ماڵپەڕەکەش یەکسەر نووسینەکەی ئەوی کردووە بە عەرەبی و ناوی وەرگێڕی لەسەر نییە، دیارە مافی وەرگێڕانەکەی دراوە بە ماڵپەڕەکە.

*ئەمە ناونیشانی ماڵپەڕی بابەتەکەیە لەسەر ئینتەرنێت:

www.maaber. com

| ناوی كتێب | نوسینی | وەرگێڕانی |
| --- | --- | --- |
| 1–ژن لە شیعرو ژیانی مندا | نزار قەبانی | جەمال غەمبار |
| 2–نیچە | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 3–سوڕی مانگانەی ژن | مارتن لۆدڤیك | ئەكرەم قەرەداغی |
| 4–دیكارت | پۆڵ ستراتێرن | ڕەئوف بێگەرد |
| 5–بیری ئاینی كۆن لە میزۆپۆتامیادا | د. تەقی دەباغ | یاسین عومەر |
| 6–ڕێبازەكانی ڕەخنەی ئەدەبی | دیاینی. دەچز. ئبرامز | عەتا قەرەداخی |
| 7–ئایین و كەسایەتی | ل. پالّس | ئاوات ئەحمەد |
| 8–هەشت نامە | گۆنتەرگراس– كینزابۆرۆئۆ | شورش جوانڕۆیی |
| 9–ئانارشیزم | د. مستەفا ڕەحیمی | ڕێباز مستەفا |
| 10–كۆمارە كوردییەكەی مەهاباد | ئارچی ڕۆزفلّت | ئەكرەم قەرەداخی |
| 11–دەربارەی دیالێكتیكی.. | موراد فەرهاد پوور | بەختیار سەجادی |
| 12–پۆزش | ئەفلاتون | ئاوات ئەحمەد |
| 13–ئاوابوونی هزرە تۆباوییەكان | ئایزایا بەرلین | كامیل محەمەد |
| 14–هونەری نیگاركێشان... | شمیدت دیجینەر | وەهبی ڕەسوڵ |
| 15–چامەی پەخشان | سۆزان بیرنار | سەلاح محەمەد |
| 16– ئایین، عەلمانییەت ، ... | محەمەد ئەركۆن | شوان ئەحمەد |
| 17– سارتەر | پۆڵ ستراتێرن | ئازاد بەرزنجی |
| 18–چۆن دەبیت بەباشترین هاوڕێی خۆت | میلدرید نیومان بێرنارد بێركۆتس | شێرزاد حەسەن |
| 19–كوردو زمانی كوردی | تۆفیق وەهبی | عەزیز گەردی |
| 20–ئەنتۆنین ئارتۆو شانۆی . | جلال ستاری | پێشڕەو حسێن |
| 21–پاسكاڵ | ئاندرێ كریسۆن | سامان عەلی |
| 22–كافكا | سادقیهیدایەت یوسف حاجی میرزای | محەمەد كەریم |
| 23–لەنێوان بلیمەتی و شێتیدا | هاشم سالّح | نەوزاد ئەحمەد |
| 24– مرۆڤ لە ڕوانگەی فرۆیدەوە | قاسم حسێن سالّح | عەبدولموتەلیب عەبدوللا |

| | | |
|---|---|---|
| 25–جیهانی ئیمپریشیێنیزم | هانز خافێ | ئیسماعیل حەمەئەمین<br>حەمەی ئەحمد رەسول |
| 26–لە"نیویۆرک"ەوەتا"کابول" | یوسف ئەبازەری<br>موراد فەرهاد پوور | مەنسوور تەیفووری<br>فەرهاد ئەمین پوور |
| 27–مۆدێرنە و ڕاسیزم | جۆرج تەرابیشی | شوان ئەحمەد |
| 28–پاش بونیادگەری | تێری ئیگلتۆن | سەلاح حەسەن |
| 29–فەلسەفەی خۆراوایی | | ئاوات ئەحمەد |
| 30–مۆدێرنەو پۆست مۆدێرنە | پیتەر کریستو | شۆڕش جوانڕۆیی |